# ئینجیلی لۆقا

## بە زمانی کوردی

## شێوەی سۆرانی

Free gift

# ئینجیل

ئینجیل ووشەیەکی یۆنانیە،بە واتای مزگێنی،یاخود هەواڵی خۆش،ئەم ناوەی لێنرا بەپێی ئەو مزگێنیەی کە درا بۆ لە دایك بوونی عیسا ئەمەش لەم ئینجیلەدا بەدی ئەکرێ. ئینجیل بریتیە لە ووشەی یەزدان،ئەوەی هەڵبژێراوانی خۆی نووسیویانەتەوە بەهۆی کارتێکردنی رۆحی رەوانەوە. چوار کەسی پیرۆز هەستاون بە نووسینەوەی،ئینجیلەکان،بەناوی ئینجیلی مەتتا،مەرقۆس،لۆقا، یۆحەننا. هەندێ کەس وا بیرئەکەنەوە کەوا جیاوازی هەیە لە نێوان ئەم چوار ئینجیلەدا،بەلام لە راستیا ووشەی یەزدان هەر یەکە. گەر لە شێوەی نووسینیانا جیاوازیەکیان هەبێ،لە ناوەرۆك و جەوهەرا هیچ جیاوازیەکیان نیە. وا ئینجیلی لۆقا ئەخەینە بەردەستان،بە هیوای وەرگێڕانی ئەوانی کەش لە داهاتوویەکی نزیکدا.

ئینجیل بانگەوازی خۆشی و خۆشەویستی و بەزەیی و رزگار بوون و ژیانی هەتاهەتایی تیایە بۆ هەموو یەکێك ئینجیل نووسراوە و وەرگێڕراوە بە زمانێکی سادە و ساکار بۆ ئەوەی هەموو چینەکانی کۆمەڵ لێی تێبگەن و واتای بزانن.

## بەشی یەکەم

کاتێ زۆر کەس،هەستان بە نووسینی ئەو ڕووداوانەی لای ئێمە ڕووی‌دابوو،٢ بەپێی ئەوەی کە بە دەستمان گەیشتبوو،لەوانەی لەسەرەتاوە بینەری ڕووداوەکان بوون‌و لەدوایشدا بوونە نۆکەری ووشەی یەزدان. ٣گەورەم ـ ساوفیلۆس ـ دوای ئەوەی کە هەموو شتێکم بە ووردی لە سەرەتای باسەکەوە پشکنی،وام بەباش زانی کە بەڕێك و پێکی بۆتی بنووسم. ٤تاوەك بەتەواوی بۆت دەرکەوێت، ڕاستی ئەو باسەی کە پێت گەیشتووە.

٥ لەسەردەمی ـ هێرۆدس ـ پاشای ناوچەی یەهودیا، قەشەیەك هەبوو ناوی ـ زەکەریا ـ بوو،لە کۆمەڵەی ـ ئەبیا ـ ژنەکەشی ناوی ـ ئەلیاسابات ـ بوو،لە نەوەی هارون. ٦ هەردووکیان بەرامبەر بە یەزدان بێ گوناە بوون. پەیرەوی ئامۆژگاری و یاسای یەزدانیان ئەکرد بەپاکی. ٧ منالّیان نەبوو،چونکە ـ ئەلیاسابات نەزۆك بوو،هەردووکیشیان زۆر چووبوون بە سالا.

٨ لەکاتێکا ـ زەکەریا ـ لە نۆرەی کۆمەڵەکەی خۆیدا، کاروباری قەشایەتی جێ بە جێ ئەکرد ٩ نۆرەی هات کە بچێتە ناو پەرستگای یەزدانەوە و بخورد بسوتێنێ.

١٠ لە کاتی سووتانی بخوردەکەدا ،خەڵکی لە دەرەوە هەموو نوێژیان ئەکرد . ١١ لەلای راستی شوێنی۔ سووتانی بخوردەکەوە فریشتەیەك دەرکەوت، ١٢ کاتێ زەکەریا ئەمەی بینی ،تێكچوو ،ترسی لێ نیشت ، ١٣ فریشتەکە پێی ووت: ئەی زەکەریا مەترسە چونکە داواکاریەکەت بیسترا ،ژنەکەت ئەلیاسابات لەتۆ کورێکی ئەبێت و ناوی ئەنێت یۆحەننا ، ١٤ خۆشی و شادی ئەبینێت و کەسانێکی زۆر بە لەدایكبوونەکەی دڵخۆش ئەبن . ١٥ بەرامبەر یەزدان زۆر مەزن ئەبێت. بابەتی سەرخۆشی ناخواتەوە و لەسکی دایکیا لەشی پڕ ئەبێت لە رۆحی یەزدان . ١٦ کەسانێکی زۆر لە خێڵی ئیسرائیل بۆ یەزدان ئەگەڕێنێتەوە، ١٧ بە رۆح و توا۔ نای نێرراوی یەزدان۔ ئەلیاسەوە۔ پێش مەسیحی چاوە۔ ڕێکراو ئەکەوێت،تاوەك منالان هەروەك باوکان بخاتەوە سەر ڕێی یەزدان و یاخیبووان بگەڕێنێتەوە بۆ بیری راستی و گەل ئامادەکات بۆ پێشوازی کردنی مەسیح . ١٨ زەکەریا بە فریشتەکەی ووت: بەچیا ئەمە بزانم، چونکە من پیاوێکی بەتەمەنم و ژنەکەشم چووە بە سالا ؟

١٩ فریشتەکە وەلامی دایەوە: من ئەو جوبرائیلەم کە لە بارەگای یەزدانا رائەوەستم،نێراوم بۆئەوەی لەگەڵت بدوێم و مژدەی ئەمەت پێ بەم. ٢٠ جائەوەتا تۆ توانای قسەکردنت نامێنێ تا ئەو رۆژەی ئەمەی تیائەبێت،لەبەر ئەوەی بە ووتەکانم کە لە کاتی خۆیا دێتەدی،باوەڕت نەکرد. ٢١ خەڵکەکەش چاوەڕوانی زەکەریایان ئەکردو سەرسام بوویوون لە دواکەوتنی ئەو لەناو پەرستگاکەدا. ٢٢ بەڵام کاتێ هاتەدەرەوە نەیتوانی لەگەڵیان بدوێ، ئنجا زانیان کە لە پەرستگاکەداشتێکی یەزدانی بینیوە. بە جولانەوە ئەدوا لەگەڵیانا و هەر بە لاڵی مایەوە. ٢٣ کاتێ رۆژانی کارکردنی لەناو پەرستگاکەدا تەواوبوو، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە. ٢٤ دوای ئەوە،ـ ئەلیاسابات ـ ی ژنی سکی پڕ بوو،ماوەی پێنج مانگ خۆی شاردەوە،ووتی: ٢٥ یەزدان وای لێکردم،لەم رۆژانەدا ئاوڕی لێ دامەوە بۆئەوەی شورەیی و سەرشۆڕیم لەناو خەڵکیا لەسەر لابەرێ ٢٦ کاتێ کە سکی شەش مانگ بوو،جوبرائیلی فریشتە لە لایەن یەزدانەوە نێررا بۆ شارێ لە ناوچەی ـ جەلیل ـ ناوی ناسیرە بوو، ٢٧ بۆلای کچێکی نیشانەکراو لە پیاوێك

که ناوی ـ یوسف ـ بوو،له بنەماڵـەی ـ داوود ـ،ناوی
ئەم کچەش ـ مریەم ـ بوو. ٢٨ فریشتەکە هاتە لای و
پێی ووت: ئەی ئەو کەسەی کە خەڵاتی یەزدانت بەسەرا
ڕژاوە سڵاوت لێبێ یەزدانت لەگـەڵـە،تۆ پیرۆزیت لەناو
ئافرەتانا. ٢٩ مریەم بە ووتەی فریشتەکە شێواو لەخـۆی
پرسی:ئایا ئەبێ ئەم سڵاوکردنە چی بێت؟ ٣٠ فریشتە
کە پێی ووت: مەترسە ئەی مریەم،تۆ خەڵاتی یەزدانت بە
دەست هێناوە، ٣١ ئا ئەوەتا سکت پڕ ئەبێ و کوڕێکت
ئەبێ ،ناوی ئەنێت ـ عـیـسا ـ. ٣٢ ئەو مەزن ئەبێت، بـە
ڕۆڵـەی یەزدان ناوئەبرێت،یەزدان تەختی ـ داوود ـ ی
باوکی پێئەبەخشێ. ٣٣ بەسەر خانەوادەی ـ یاقـوبا ـ
هەتاهەتایە پاشاهێتی ئەکات،پادشاهیەکەی کۆتای بـۆ
نیە. ٣٤ ـ مریەم ـ بە فریشتەکەی ووت: چۆن شتی وا
ئەبێت،کەمن هیچ پیاوێك بەلاما نەهاتبێ؟ ٣٥ـ فریشتە
کە وەلامی دایەوە: رۆحی یەزدان دێ بە سـەرتـا و
هێزی یەزدان سایەی سەرت ئەبێت.چونکە ئەو پیرۆزەی
لێت ئەبێت بە ڕۆڵـەی یـەزدان نـاو ئـەبـرێـت.
٣٦ ئا ئەوەتا ـ ئەلیاسابات ـ ی خزمیشت هەروەها بەو

تەمەنە بەسالآچووەوە سکی‌پڕە بە کوڕێك . ئا ئەوەی کە پێیان ئەووت نەزۆك سکی شەش مانگە ٣٧ هیچ پەیما- نێك نیە لای یەزدان کە نەتوانێ بیباتەسەر ٣٨ مریەم ووتی : ئا ئەوەتا من مل‌کەچی یەزدانم. ئەوەی کە ئەی- لێت رازیم بەبوونی ئینجا فریشتەکە ئەوێی بەجێ‌هێشت ٣٩ هەر لەو رۆژانەدا ،- مریەم - بەخێرایی بەرەو شاخ ڕۆیشت،بە مەبەستی شارێ لە شارەکانی ناوچەی یەهوزا ٤٠ چووە ماڵی - زەکەریا - و سلاوی لە - ئەلیاسابات کرد . ٤١ کاتێ - ئەلیاسابات - گوێی لە سلاوی مریەم بوو،مناڵەکە ٤٢ لە سکیا جولا ،ئینجا - ئەلیاسابات - - لەشی پڕ بوو لە ڕۆحی یەزدان . بە دەنگێکی بەرز ها- واری کردو ووتی : تۆ لەناو ژنانا پیرۆزیت پیرۆزە ئەوەی لە سکتایە ٤٣ ئا ئەمەم لە کوێوە بۆ ئەبێت،کە دایکی گەورەکەم بێت بۆلام ؟ ٤٤ هەر کە سلاوی تۆ گەیشتە گوێم،لە خۆشیا مناڵەکە لە سکما جولایەوە ٤٥ خۆزگە بەوەی کە باوەڕی هێناوە بەوەی چی لە یەزدانەوە پێی ووتراوە یەتەدی ٤٦ - مریەم - ووتی : بە هەموو دڵەوە ستایشی یەزدان ئەکەم ،دڵشادم بە یەزدانی رزگارکەرم.

٤٨ ئەو ڕوانیە ملکەچی کارەکەرەکەی ،ئا ئەوەتا لەمەولا بە دواوە هەموو نەوەکان ئاواتم پێئەخوازن . ٤٩ چونکە تواناداری کاری مەزنی بەمن ئەنجامدا ،پیرۆزە ناوی ئەو، ٥٠ بەزەیی بۆ ئەوانەیە کە نەوە دوای نەوە ئەی پەرستن ٥١ بە بازوی ،توانای دروستکرد ،خواستی دڵی لووت بەرزەکانی تەفروتونا کرد ، ٥٢ تواناداەرکانی لە تەختە ـ کانیان هێنایە خوارەوە بێهەواوفیزەکانی بڵندکردەوە . ٥٣ برسیەکانی بە چاکە تێرکرد و دەوڵەمەندەکانی بە ـ دەستی بەتاڵ رەوانەکرد . ٥٤ یارمەتی ئیسرائیلی رۆڵەی خۆی دا . تا بەزەیی بخاتەوەبیر .
٥٥ هەروەك چۆن لەگەڵ باووباپیرانمانا ،ئیبراهیم و وەچەکانی هەتاهەتایە دوا .
٥٦ ئینجا ـ مریەم ـ لای ـ ئەلیاسابات ـ نزیکەی سێ مانگ مایەوە ،دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ ماڵەوە .
٥٧ ـ ئەلیاسابات ـ کاتی مناڵبوونی هات و کوڕێکی بوو . ٥٨ دراوسێکانی و خزمانی بیستیان کە یەزدان بەزەیی خۆی بەسەرا ڕژاندوە ،لەگەڵیا شادمانبوون .
٥٩ لە ڕۆژی هەشتەمدا ئامادەبوون ،بۆ ئەوەیکوڕەکە

خەتەنە بکەن ،خەریك بوو ـ زەکەریا ـ ی ناوبنێن ،لەسەر ناوی باوکی. ٦٠ بەڵام دایکی ووتی: نەخێر،بەڵکو ـ یۆحەننا ـ ی ناوئەنرێ ٦١ پێیان ووت: کەس نیە لە خێڵتا بەم ناوە ناونرابێت. ٦٢ بە باوکیان ووت چ ـ ناوێکی ئەوێ ناوبنرێ؟ ٦٣ تەختەیەکی داوا کردوو لە سەری نووسی ( ناوی یۆحەننایە) هەموویان لەمە سەرسام بوون. ٦٤ دەست بەجێ ـ زەکەریا ـ زمانی کرایەوە دەستی‌کرد بە ستایشی یەزدان. ٦٥ هەموو ئەوانەی نزیکیان نیشتەجێ بوون ،ترسیان لێ‌نیشت،ئەم کارانەش لە چیای ناوچەی ـ یەهودیا ـ دا بو بە باس و قسەی ناو خەڵکی. ٦٦ هەموو ئەوانەی کە ئەمەیان بیست، ئەم باسەیان خستە دڵیانەوە و ووتیان :ئایا ئەم منالە ئەبێ بە چی؟ ئەوەتا دەستی یەزدانی لەگەڵایە.

٦٧ لەشی ـ زەکەریا ـ ی باوکی پڕ بوو لە رۆحی یەزدان ، وەك نێرراوێکی یەزدان، ٦٨ ووتی: پیرۆز بێت گەورە و یەزدانی ئیسرائیل ،چونکە چاوی بە گەلەکەیا خشاندوو رزگاری کرد. ٦٩ لە ماڵی ـ داود ـ ی ڕۆڵەی خۆی ، هێزی رزگاری دروست کرد. ٧٠ هەروەك لەسەر زمانی

نێرراوانی یەزدان و پیاوچاکان ،ئەوانەی لە کۆنەوە هات بوون قسەی کرد و پەیمانی‌دا . ٧١ بۆ رزگاریمان لە دوژمنان و ئەوانەی ناحەزمان، ٧٢ بەزەیی هاتەوە بە باو و باپیرمانا و بەڵێنی پیرۆزی خۆی بیرنەچوو . ٧٣ واتا ئەو سوێندەی کە بۆ ئیبراهیمی ـ باوکمانی خواردوە ،کە ٧٤ دوای رزگاریمان لەدەستی دوژمنان، پێمان ببەخشێ پەرستنی بێ ترس - ٧٥ بە پاکی و پیرۆزی و بێ گوناهی ،بە درێژایی ژیانمان . ٧٦ تۆش ئەی مناڵ ،ناوئەبرێت بە ـ نێراوی یەزدان ـ لەبەر ئەوەی پێش رزگارکەر ئەکەویت تاوەك رێگاکانی بۆ ئامادەکەیت، ٧٧ تاوەك لە گەل بگەیەنیت کە رزگاریان ئەبێت،بە لێ‌خۆش بوون لە گوناهیان . ٧٨ بە سایەی بەزەیی یەزدانەوە کە لە ڕۆژ هەڵاتی بەرزەوە رۆشنایی ئەدات. ٧٩ تا روناکی بداتە دانیشتوانی ناو تاریکی سێبەری مردن و هەندێکیشیان بەرەو رێگەی ئاشتی ئەبات. ٨٠ منالەکە بە رۆح نشونمای ئەکرد و بەهێز ئەبوو ،لە دەشت و دەر مایەوە تا ئەو رۆژەی خۆی دەر- خست بۆ ئیسرائیل .

## بەشی دووهەم

١ لەو سەردەمەدا ،لە ـ ئوغستۆس ـ قەیسەرەوە فرمان دەر
چوو کە هەموو دانیشتوانی وولاتەکەی ناونووس بکرێت.
٢ ئەم ناونووس کردنەش یەکەم جاری بوو،لە کاتێکا ـ کیر ـ
ینیۆس ـ فەرمانڕەوای ـ سوریا ـ بوو. ٣ خەڵکی ڕۆیشت
تن ،هەریەکە بۆ شاری خۆی تاوەك ناونووس بکرێن. ٤جا
یوسف،لە شاری ناسرەوە کە لە ناوچەی ـ جەلیل بوو،
بەرەو شارەکەی داوود ڕۆیشت کە ناوی ـ بەیت لەحم ـ ـ
بوو لە ناوچەی یەهودیا. چونکە ئەو لە بنەماڵەو هۆزی
داوود بوو. ٥ تاوەك لەگەڵ ـ مریەمی ـ دەزگیرانی کە
لەو کاتەدا سکی هەبوو،لەوێ ناونووس بکرێن. ٦
هەر لەوکاتەدا کە ئەمان لەوێ بوون ،کاتی منالٌبوونی هات
٧ لەبەر ئەوەی لە میوانخانە شوێنیان نەبوەوە چوونە ـ
تەویلەیەك لەوناوە،ئینجا لەوێدا کوڕ ەنۆبەرەکەی بوو ،پێچا ـ
یەوە و لە ئاخوڕی تەویلەکەدا خەواندی.
٨ لەو ناوچەیە شوان هەبوون لە دەشت ئەمانەوە و بە
نۆبە ئێشکی مێگەلیان ئەگرت. ٩ فریشتەیەك لە لایەن
یەزدانەوە هاتە لایان ،گەورەیی و شکۆهی یەزدان لە
دەوروپشتیان ڕووناکیدا ،بەمە ترسێکی زۆریان لێنیشت.

١٠ فریشتەکە پێی ووتن : مەترسن ،ئەوا من مژدەیەکی خۆش و مەزنتان پێ ئەدەم کە بۆ هەموو گەلە. ١١ ئەمڕۆ لە شاری - داوود - ڕزگارکەرێ لەدایك بوو ،ئەویش کە عیسای خوداوەندە. ١٢ ئەمەش نیشانە بێ بۆتان ، منالێکی پێچراوەی نووستو لە ئاخوڕێکا لەوێ ئەبینن. ١٣ لە پڕێکا لەگەڵ فریشتەکەدا کۆمەڵێ هێزی ئاسمانی دەرکەوتن ،ستایشی یەزدانیان ئەکردو ئەیان ووت: - شکۆ و مەزنی بۆ یەزدانە لە ئاسمانی بەرزا و بۆ سەر زەویش ئاشتی ،بۆ خەڵکیش خۆشحاڵی ) ١٥ -- کاتێ فریشتەکە لای شوانەکان بەرەو ئاسمان ڕۆیشت ، یەك بە یەکیان ووت: ( کەواتە با بڕۆین بۆ - بەیت - لەحم - ئەوەی پێمان ووترا لە ئاسمانەوە و ڕوویداوە ، بیبینین ) ١٦ بەخێرایی هاتن شوێنەکەیان دۆزیەوە ، مریەم - و - یوسف و منالەکەیان بەنووستویی لە ئاخورەکەدا دی . ١٧ کاتێ ئەمەیان دی ،دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵەی لە بارەی ئەو منالەوە پێیان ووترابوو. ١٨ هەموو ئەوانەی گوێیان لەمە بوو ،سەریان سورما لەوەی کە شوانەکان ئەیان ووت. ١٩ بەڵام مریەم

ئەم شتانەی هەموو لە بیری خۆیا هەڵئەگرت و لە دڵی خۆیا لێکی ئەدایەوە. ٢٠ دوای ئەوە شوانەکان گەڕانەوە شوێنی خۆیان، دەم بە ستایشی یەزدانەوە بۆ هەموو ئەوانەی کە بیستیان و دیبیان، وەك پێیان ووترابوو.
٢١ کاتی خەتەنەکردنی منالەکە، دوای بەسەرچوونی هەشت ڕۆژ بەسەر لە دایك بوونیا، ناوی نرا ـ عیسا ـ هەروەك چۆن لەسەر زمانی فریشتەکەدا لە پێشەوە ناوی نرا ٢٢ دوای ئەوەی کە ڕۆژانی پاکبوونەوە تەواوبوو، بە پێی یاسای موسا، برا بۆ ـ ئۆرشەلیم ـ، تاوەك پێشکەشی یەزدانی بکەن. ٢٣ هەروەك چۆن لە یاسای یەزدانا ـ نووسراوە هەموو منالێکی نۆبەرە پێشکەش بە یەزدان ئە ـ کرێ، ٢٤ دیسان با پێشکەش بکرێ، وەك ووتراوە لە یا ـ سای یەزدانا: جووتێ کوور کوور یاخود جووتێ بێچوی کۆتر. ٢٥ لە ـ ئۆرشەلیم ـ پیاوێك هەبوو ناوی ـ سە ـ معان ـ بوو، پیاوێکی یەزدانناس و بێگوناه بوو، چاوە ـ ڕوانی دڵدانەوە بوو بۆ گەل، ڕۆحی یەزدانیشی تیابوو ٢٦ ڕۆحی یەزدان ئاگاداری کردبوو، کە نامرێ تا مە ـ سیحی خوداوەند نەبینێ.

٢٧ بە هۆی رۆحی یەزدانەوە بۆ پەرستگا هات بـوو. کاتێ دایك و باوکەکەی عیسای منالـیان هێنا تا پێشکە شی کەن بەو شێوەیەی کە لە یاسادایە، ٢٨ سـەمـعـان منالـەکەی خستە سەر هەردوو دەستی و ستایشی یەزدا- نی کرد و ووتی: ٢٩ ( ئەی گـەورەم،ئینجا نـۆکـەری - خۆت بەرەڵاکە بە ئاشتی ،وەك پەیمانت دا . ٣٠ ئەوا چاوم ڕزگـارکەرەکەی تۆی بینی ٣١ ئەوەی ئامادەت کردوە پێش کەشی کەیت بۆ هەموو گـەلان، ٣٢ رووناکی بێ بۆ نەتەوە- کان و شکۆ بێ بۆ گـەل . ) ٣٣ دایك و باوکی سەر- سام بوون لەوەی دەربارەی منالـەکە ووترا. ٣٤ سەمعان داوای پیرۆزی بۆ کردن و بە مریەمی دایکی منالـەکـەی ووت: ( بەهۆی ئەم منالـەوە،ژیانی کەسانێکی زۆر لـە ئیسرائیل دیاریئەکرێ.ئەبێتە هۆی تاوانبـار کـردنـی بەشێك و ڕزگـارکردنی بەشێکی کە کەسانێکی زۆر رائە - وەستن بەرامبەری،بە هەموو توانایانەوە. لەمەدا بەربەرە - کانیان بۆ یەزدان دەرئەکەوێت - ٣٥ تۆش ئازار ئەچێژ- یت،ئازارێ وەك شیرێ چۆن دڵ ئەبڕێ. تاوەك دەرکە- وێ نیازی دڵـی زۆر کەس . )

٣٦ نێرراوێکی یەزدان کە حەنەی کچی فەنوئیل ی پێ‌ـ
ئەوترا ،ئەگـەڕایەوە بۆ تیرەی ئەشیر ،تەنها حەوت ساڵ لە
گـەڵ میردەکەیا بوو ،دوای ئەوە بە بێوەژنی مابووەوە.
٣٧ لەو کاتەدا پیرەژنێکی هەشتا و چوار ساڵـە بوو.
پەرستگاکەی بەجێ نەئەهێشت،شەو و ڕۆژ یەزدانی ئـەـ
پەرست،بە نوێژ و ڕۆژوگـرتن. ٣٨ لەو کاتەدا ئامادە
بوو،دەستی‌کرد بە ستایشی یەزدان و باسی عیسای لەـ
گـەڵ هەموو ئەوانەدا کرد کە لە ئۆرشەلیم چاوەڕوانـــی
ڕزگـارکەر بوون . ٣٩ دوای ئەوەی تەواو بوو هـەموو
ئەوانەی یاسای یەزدان داوای ئەکات ،دایك و باوکی
عیسا گـەڕانەوە بۆ شارەکەیان کە ناوی ناسرە بـوو لـە
ناوچەی جەلیل . ٤٠ منالـەکە نشونمای ئەکرد و بەهێز
ئەبوو،پڕ ئەبوو لە دانای و دەستی پیرۆزی یەزدانی بـە
سەرەوە بوو.
٤١ دایك و باوکی هەموو سالـێك لە جەژنی قوربانـا
ئەچوون بۆ ئۆرشەلیم. ٤٢ کاتێ عیسا تەمەنی گـەیشـتە
دوانزە ساڵ ،وەك هەموو سالانی کە لە جەژنا بەرەو ئۆرـ
شەلیم ڕۆیشتن . ٤٣ دوای تەواوبوونی ڕۆژانی جەژن

دایك و باوکی گەڕانەوە،عیسای منالّ مایەوە لە ئۆرشە-
لیم،بێ ئەوەی ئەمان بزانن ٤٤ وایان بیرکردەوە کە لە
گەلّ هاوڕێکانیانایە بە ڕێگاوە،ڕۆژە ڕێگایەك ڕۆیش -
تن ،دوای ئەوە دەستیان‌کرد بە پشکنین بە دوایا لە
نێوان خزم و ناسیاوەکانیانا . ٤٥ کاتێ نەیان دۆزیەوە،
گەڕانەوە بۆ ئۆرشەلیم تا بە دوایا بگەڕێن . ٤٦ دو -
ای سێ ڕۆژ گەڕان دۆزیانەوە لە پەرستگاکەدا ،بە -
دانیشتنەوە لە نێوان مامۆستایانا ،گوێی بۆ راگرت بوون
پرسیاری ئاراستە ئەکردن . ٤٧ هەموو ئەوانەی گوێیان
لێی‌بوو،سەرسام بوون لە تێگەیشتن و وەلامدانەوەی .
٤٨ کاتێ بینیان سەریان‌سوڕما ،ئینجا دایکی پێی ووت
(کوڕم بۆ وات لێ‌کردین؟ من و باوکت بە دواتا ئەگە-
ڕاین بە پەژارەوە ٤٩ وەلامی‌دانەوە ووتی : بۆچی
بە دواما ئەگەران؟ ئایا نەتان زانی پێویستە لە سەرم،
لەو جێیە بم کە هی باوکمە؟ ٥٠ بەلام ئەوەی کە پێی‌وو-
تن ،ئەوان تێ‌نەگەیشتن . ٥١ ئینجا بەرەو شاری -
ناسرە گەرایەوە لە گەلّیانا ،مریەمی دایکیشی ،ئەمانەی
هەموو ئەخستە دلّیەوە . ٥٢ عیساش لە دانایی و گەو-
رە بوونا پێش ئەکەوت،دیسانەوە لە پیرۆزیشدا لای یەزد-
ان و لای خەلّکی .

١ لە سالّی پانزەهەمینی فەرمانڕەوایی تێباریۆسی قەیسە
را ،کاتێ بونتیۆس بیلاتوس،لێپرسراوی ناوچەی یەهودیا
بوو ،هەروەها هێرۆدس لێپرسراوی ناوچەی جەلیل و برا-
کەشی فیلیبوس لێپرسراوی ناوچەی ئیتۆریە و تەراخونیتس
بوو ،دیسانەوە لیسانیوس لێپرسراو بوو بەسەر ناوچەی -
ئیبیلیەوە، ٢ لە سەردەمی سەرۆکایەتی حەنان و قیافا
بەسەر قەشەکانا ،کاتێ یۆحەننا لە بیابانا بوو ووشەی یەز-
دان هاتەخوارەوە بۆی. ٣ ئینجا هات بۆ هەموو ئەو
ناوچانەی کەوتبوونە سەر رووباری ئوردن بۆ خۆ لەئاوهەلّ
کێشان لە پێناوی پەشیمان بوونەوە و پاکردنەوەی گونا-
هدا ، ٤ هەروەك چۆن لە پەرتووکی نێرراوی یەزدان
ئەشعیا نووسراوە: ( لە بیابانەوە دەنگێك بانگ ئەکات
ڕێگای یەزدان ئامادەکەن و ڕێبازەکانی ڕێكخەن
٥ هەموو دۆلّێك پڕ ئەکرێتەوە و هەموو چیاو گردۆلّکەیە-
کیش نزم،هەموو شوێنە پێچاو پێچەکان راست ئەبنەوە و
شوێنی چالّ و چۆلّ ئەبنە ڕێگای ڕێکورەوان، ٦ هەموو
کەسێ چاوی بە ڕزگارکەر ئەکەوێ )
٧ بە هەموو ئەوانەی کە بۆ خۆ لە ئاوهەلّکێشان هاتبون

ووتی : ( ئەی نەوەی مار،کێ ئاگاداری کردن تاوەك
ڕاكەن لە تووڕەی داهاتوو؟ ٨ بەرووبوومێ بدەن كـە
شایانی پەشیمانبوونەوە بێت،لەناو خۆتانا مەڵێن : ئـێمـە
ئیبراهیمی باوكمان هەیە من پێتان ئەڵـێـم،یــەزدان
توانای ئەوەی هەیە ئالەم بەردانە نەوە بۆ ئیبراهیم درو-
ست بكات. ٩ ئێستاش ئەوا تەور خراوەتە سەر قەدی دار،
هەر دارێك بەرووبوومی باش نەداتـئەبڕ رێتەوە و فـڕێ
ئەدرێتە ناو ئاگرەوە ) ١٠ خەڵكەكە پرسیاریان لێ كرد ،
كەواتە چی بكەین؟ ١١ وەلامی دانەوە : (ئەوەی دوو كر-
اسی هەیە،با یەكێكیان بدا بەوەی كە نیەتی،ئەوەش كـە
نانی هەیە،با هەمان شت بكات. ) ١٢ هەندێ لە باج
گـرەكانیش هاتبوون بۆ خۆ لە ئاو هـەڵـكـێـشـان ،پرسیار
یان لێ كرد : (ئەی مامۆستا ،ئێمە چی بكەین ؟ ) ١٣ـپێ
یانی ووت: (لەوەی دانراوە بۆتان زیاتر مەسەنن . )
١٤ دیسانەوە هەندێ سەرباز پرسیاریان لێ كرد : (ئەی
ئێمە چی بكەین؟ ) وەلامیدانەوە : (زۆرداری لە كەس مـە-
كەن ،بەدرۆ كەس تاوان بار مەكەن ،با بەشتانكات ئـەوەی
وەری ئەگـرن )

١٥ لەبەر ئەوەی گەل چاوەڕێی مەسیحیان ئەکرد ،هەموو لە خۆیان ئەپرسی : (تۆ بلێی یۆحەنای خەڵك لە ئاو هەڵکێش،مەسیحی چاوەڕێ کراو بێ ؟ ) ١٦ یۆحەننا وەلامی خەڵکەکەی دایەوە : (من هەڵتان ئەکێشم لە ئاو، بەلام ئەوەی دێت لەمن بە تواناترە ،ئەوەی کە من تەنانەت شایستەی کردنەوەی قەیتانی پێلاوەکانی نیم ،ئەو هەڵتان ئەکێشێ لە رۆحی یەزدان ،لە ئاگر . ١٧ ئەو شەنی بە دەستەوەیە بۆ پاك کردنەوەی خەرمانەکەی بە تەواوی گەنمە-کە لە ئازوخ گەدا کۆ ئەکاتەوە و کاکەش ئەسوتێنێ بە ئاگرێ کە ناکوژێتەوە . )

١٨ دیسان بە زۆر شتی کە ،ئامۆژگاری گەلەکەی ئەکرد مژدەی ئەدانێ .

١٩ بەلام هێرۆدس کە لێ پرسراوی ناوچەکە بوو ،لەلایەن یۆحەنناوە ئاگادار کرابووەوە ،بە هۆی دەست تێ کەلاو-کردنی لەگەڵ هێرۆدیای براژنی و ئەو هەموو خراپانەی کە ئەی کرد ، ٢٠ خراپەیەکی تریشی خستە پاڵ خراپەکا-نی پێشووی ئەویش بە زیندان کردنی یۆحەننا .

٢١ کاتێ گەل هەموو خۆیان لە ئاو هەڵکێشا ،عیساش

خۆی لە ئاو هەڵکێشا ،لەو کاتەدا نوێژی ئەکرد ،ئاسمان
کرایەوە،٢٢ رۆحی یەزدان لە شێوەی لەشی کۆترێکا لە
سەری نیشتەوە ،دەنگێك لە ئاسمانەوە هات و ووتی : تۆی
کوڕی خۆشەویستم ،من پێت دڵشاد بووم.
٢٣ کە کاتێ عیسا دەستی بە کاری یەزدانی کرد ،تەمە-
نی نزیکەی سی ساڵ بوو ،ناسرابوو بەوەی کە کوڕی یو-
سف کوڕی عالیە،٢٤ کوڕی مەتسات کوڕی لاوی ،کوڕی
مولڵکی کوڕی یەننا ،کوڕی یوسف ٢٥ کوڕی مەتتاسیا ،
کوڕی عاموس کوڕی ناحوم ،کوڕی حەسلی کوڕی نەجای ،
٢٦ کوڕی مائاس کوڕی مەتاسیا ،کوڕی شەمعێ کوڕی
یوسف ،کوڕی یەهوزا ٢٧ کوڕی یۆحەننا ،کوڕی ریسا
کوڕی زەربابل ،کوڕی شائەلتیئیل کوڕی نیری،٢٨ کوڕی
مولڵکی کوڕی ئادی ،کوڕی قوسەم کوڕی ئەلمودام کوڕی
عیری،٢٩ کوڕی یوسی ،کوڕی ئەلیعازەر کوڕی یوریم ،
کوڕی مەتسات کوڕی لاوی ،٣٠ کوڕی شەمعون کوڕی
یەهوزا ،کوڕی یوسف کوڕی یۆنان ،کوڕی ئەلیاقیم،٣١
کوڕی مەلیا کوڕی مەینان ،کوڕی مەتاسا کوڕی ناسان ،
کوڕی داود ٣٢ کوڕی یەسی ،کوڕی عوبەید کوڕی

یوعەز،کوڕی سەلمون کوڕی نەحشون،٣٣ کوڕی عەمینا-
داب کوڕی ئەدمین،کوڕی عەرنی کوڕی حەسرون،کوڕی
فارس کوڕی یەهوزا،٣٤ کوڕی یاقوب کوڕی ئیسحاق،
کوڕی ئیبراهیم کوڕی تارح،کوڕی ناحور،٣٥ کوڕی-
سەروج،کوڕی رەعو کوڕی فالج،کوڕی عابر کوڕی شالح،
٣٦ کوڕی قینان کوڕی ئەرفەك شاد،کوڕی سام کوڕی
نوح،کوڕی لامەك،٣٧ کوڕی مەتوشالح،کوڕی ئەخنوخ
کوڕی یارد،کوڕی مەهللئیل کوڕی قینان،٣٨ کوڕی
ئەنوش کوڕی شیس،کوڕی ئادەم ڕۆڵەی یەزدان.

## بەشی چوارەم

١ کاتێ عیسا لە ئوردون گەڕایەوە،لەشی پڕ بوو بوو لە رۆحی پیرۆز. ٢ ماوەی چل رۆژ رۆحی یەزدان لە بیابانا بردی بەڕێوە،شەیتانیش تاقیئەکردەوە. بەدرێژایی ئەو رۆژانە هیچی نەخوارد ،کاتێ ماوەکە تەواوبووبرسیبوو ٣ شەیتان پێی ووت: (گەر راستەوتۆ رۆڵەی یەزدانی، بەو بەردە بڵێ با ببیت بەنان. ) ٤ عیسا وەلامی - دایەوە ووتی: (نووسراوە مرۆڤ هەر بە تەنها بە نان ناژی ،بەڵکو بەهەموو ووشەیەك کە لە یەزدانەوەیە. ) ٥ ئینجا شەیتان بردیە سەر شاخێکی بەرز و هەموو پاشاهێتی جیهانی بە چاوتروکانێكپیشاندا و،٦ ووتی: (دەسەلاتی فەرمان رەوایی ئەم هەموو پادشاهیانەت ئەدەمێ بە هەموو شکۆیەکەوە کە تیایەتی ،چونکە دراوە بە من و منیش ئەی دەم بە هەر کەسێ بمەوێ. ٧ گەر کڕنووشت بۆ بردم،ئەوا هەمووی ئەبێ بە هی تۆ) ٨ عیسا وەلامی دایەوە و ووتی: (نووسراوە کە بۆ یەزدانت کڕنووش بەرەو بە تەنها هەر ئەو بپەرستە) ٩ ئینجا شەیتان بردی بۆ ئۆرشەلیم،لەسەر قەراغی سەربانی پەرستگاکە ڕایگرت و پێی ووت: ( گەر ڕاستە

تۆ ڕۆڵەی یەزدانی ،لێرەوە خۆت فڕێ دە خــوارەوە ، ١٠ چونکە نووسراوە : بە فریشتەکانی ئەڵێ کە پارێزگـا-
ریت کەن ، ١١ لەسەر دەستیان هەڵت ئەگـرن نـەوەك
قاچت بەر بەرد بکەوێت) ١٣ کاتێ شەیتان هەموو تاقی
کردنەوەکانی تەواوبوو ،بـەجـێـی هـێـشـت تا کاتێـکی تر.
١٤ عیسا بە هێز و توانای ڕۆحەوە بۆ ناوچەی جەلیـل
گـەڕایەوە ،ناوبانگـی لەو دێیانەی دەوروپشت هەموو بڵاو-
بوەوە. ١٥ لە شوێنی کۆبونەوەی جولەکەکانا خەڵـکی فێر-
ئەکـرد ،هـەمـوویـان سـتـایـشـیـان ئـەکـرد .
١٦ ئینجا هات بۆ ناسیرە ئەو شوێنەی لێی پـەروەردە
بوو ،چووە شوێنی کۆبوونەوە ،هەروەك جارانی ڕۆژی
شەممە ،ڕاوەستا بۆ خوێندنەوە . ١٧ پەرتـووکـی نـێرراوی
یەزدان ئەشعیا یان دایە دەستی،کاتێ کـردیـەوە ئـەو
شوێنەی بەرچاوکەوتکە تیا نووسراوە : ١٨ (ڕۆحی یـەز-
دانم تیایە ،چونکە بانگـی کردووم تاوەك مـژدە بـەم بـە
هەژاران ،ناردوومی تاوەك بۆ دیل کراوان داوای ئازا-
دی کەم ،بۆ کوێران داوای رووناکی کەم ،تاوەك بێ شێلرا-
وان ڕزگـار کەم، ١٩ ساڵـی ڕەزامەندی یەزدان بانگـە-

وازەکەم. ٢٠ ئینجا پەرتووکەکەی داخست و دایە دەست ئیشکەری ئەو شوێنە و دانیشت. هەموو ئەوانەی کە ئامادە بوون لە شوێنی کۆ بونەوەکە چاویان تێ بڕی بوو ٢١ قسەی بۆ کردن و ووتی: (وا ئەمڕۆ هاتەدی ئەوەی کە گوێتان لێ بوو. ٢٢ هەموو دانیشتوان دانیان پێدانا و سەرسام بوون لەو ووتە پیرۆزانەی کە پێی ئەدوا، ئینجا پرسیاریان کرد: (ئایا ئەمە کورەکەی یوسف نیە؟) ٢٣ عیسا پێی ووتن: (بێ گومان ئێوە پێم ئەڵێن، ئەی پزیشك جارێ چارەسەری خۆت بکە ئەوەی بیستمان کە لە کەفەرناحوم کردت لێرەش لە شارەکەتا بیکە....) ٢٤ دیسان بەردەوام بوو ووتی: (ڕاستی پێتان ئەڵێم، هیچ نێرراوێکی یەزدان لە شارەکەی خۆیدا پەسەند ناـ کرێ. ٢٥ لە ڕاستیا پێتان بڵێم، لە سەردەمی ئیلیا لە ئیسرائیل بێوەژنی زۆر هەبوون، کاتێ ڕووی ئاسمان سێ ساڵ و شەش مانگ داخرا، تاوەك برسێتیەکی گەورە لە هەموو سەر زەویدا ڕوویدا، ٢٦ بەڵام ئیلیا نەنێررابۆ کەس لەوانە، تەنها بۆ ئافرەتێکی بێوەژن نەبێ لە سەرفە کە لە ناوچەی سەیدایە. ٢٧ لە ئیسرائیل لە سەردەمی

ئەلی شاعی نێرراوی یەزداندا زۆر کەس تووشی نەخۆشی گولی هاتبوون بەلاّم هیچیان چانەکرانەوە،تەنها نوعمانی سوری نەبێ ) ٢٨ هەموو ئەوانەی لە شوێنی کۆبوونەوەکە بوون،کە ئەمەیان بیست ڕقیان هەلّسا. ٢٩ دەریان- کردە دەرەوەی شارەکە،بردیانە قەراخ ئەو چیایەی کە شارەکەیانی لەسەر دورست کرابوو،تاوەك لەوێوە فڕێی- بدەنە خوارەوە. ٣٠ بەلاّم دەربازبوو لەناویانا و لەوێ ڕۆی.

٣١ داکشابەرەوشاری کەفەرناحوم،کە شارێ بوو لە ناو- چەی جەلیل،لەوێ لە شەممانـدا خەلّکی فێرئەکرد. ٣٢ زۆر سەریان سوڕما لە فێرکردنەکانی،لەبەرئەوەی کە ووشەکانی ووشەی یەکێکی توانادار بوو. ٣٣ لە شوێنی کۆبوونەوەکەدا پیاوێك هەبوو کە ڕۆحی شەیتانی تیابوو. هاواری کرد بە دەنگێکی بەرز: (ئای چیت ئەوێ لێمان ئەی عیسای ناسری؟ هاتویت لەناومان بەری؟ من ئەزانم تۆ کێیت،تۆ پیرۆزی لای یەزدان.) ٣٥ عیسا هەڕە- شەی لێ کرد و ووتی: (بێ دەنگ بەو لە لەشی وەرە دەرەوە.)ئینجا شەیتانەکە کابراکەی کوتا بە زەویدا و لە

لەشی هاتە دەرەوە،بێ ئەوەی زیانی کەی پێ بگەیەنێ.
٣٦ هەموو سەرسام بوون،پرسیاریان لە نێوان خۆیانا ئەکرد: (ئەمە چ ووشەیەکە؟ ئاوها بەتوانا و بەهێزە، فرمان ئەدا بە ڕۆحە پیسەکان تا لە خەڵکی بێنەدەرەوە
٣٧ ناوبانگی عیسا لە هەموو شوێنێك لەو ناوچەیە بڵاوبووەوە. ٣٨ دوای ئەمانە شوێنی کۆبونەوەکەی بەجێ- هێشت و چووە ماڵی شەمعون. خەسوی شەمعون تایەکی توندی لێ هاتبوو،داوایان لێ کرد یارمەتیبدات.
٣٩ ئەویش لای جێگەکەیەوە ڕاوەستا و تاکەی لێ دوور- خستەوە. ژنە یەکسەر هەستایە سەرپێو دەستی کرد بە خزمەت کردنیان. ٤٠ کاتێ ڕۆژ ئاوابوو،هەموو ئەوانەی کە نەخۆشیان هەبوو،هەریەك لە جۆرێك و لە ڕەنگێ، هێنایانەلای عیسایەکەیەکە دەستی لەسەر دانان و چاکی کردنەوە. ٤١ ڕۆحی پیسی لە زۆریان دەرکرد،لەکاتێکا ڕۆحەکان هاواریان ئەکرد: (تۆی ڕۆڵەی یەزدان) دەری ئەکردن و نەیئەهێشت زۆربلێن،چونکە زانیان کە ئەو مەسیحی چاوەڕێ کراوە.
٤٢ کاتێ ڕۆژ هەڵات،هەستاو ڕۆیشت بۆ جێگایەکی

چۆڵەوانی ،خەڵکەکە بە دوایا گەڕان تا دۆزیانەوە، گرتیان تاوەك لایان نەڕوات. ٤٣ بەڵام پێی ووتن: (پێویستە لەسەرم،مژدەی پاشایەتی ئاسمان بە شارەکانی تریش بدەم،چونکە من بۆ ئەمە نێرراوم.)
٤٤ لەوێ ڕۆیشت دەستیکرد بە بانگەواز لە شوێنی کۆبوونەوەی جولەکەکانا.

## بەشی پێنجەم

١ لە کاتێکا کە عیسا ڕاوەستابوو لەسەر کەناری دەریا-
- چەی جەنی سارەت،خەڵکەکە هەموو کۆمەڵ بووبوون لە
دەوری تاوەك گوێ بگرن لە ووشەی یەزدان .
٢ دوو بەلەمی دی لای دەریاچەکەوە ڕاوەستابوون ،
ماسیگرەکان بەجێیان هێشتبوو،تۆرەکانیان ئەشت.
٣ چووەناو یەکێکیان ،کە هی شەمعون ناوێك بوو،داوای
لێ کرد کە هەندێ لە کەناری دەریاچەکە دووری بخا-
تەوە ،ئینجا دانیشت و لەناو بەلەمەکەوە دەستی کرد بە
فێرکردنی خەڵکەکە . ٤ کاتێ ووتەکانی تەواوکرد بە
شەمعونی ووت: (دوورکەوەرەوە بۆ شوێنی قولایی ،جا تۆرە-
کانتان فڕێ بەن بۆ ڕاوکردن . ) ٥ شەمعون وەلامی-
دایەوە: (گەورەم بە درێژایی شەو هەڵماندا بەلام
هیچمان ڕاونەکرد . بەلام لەبەر قسەی تۆ ئەوا تۆڕ -
فڕێ ئەدەم) ٦ کاتێ ئەمەیان کرد ماسیەکی زۆریان
ڕاوکرد ، بە شێوەیەك کە تۆڕەکەیان نەیئەگرت.
٧ بانگی هاوڕێکانیان کرد کە لە بەلەمەکەی کەدا بوون ،
تاوەك بێن و یارمەتیان بدەن ،هاتن و هەردوو بەلەمەکە-
یان پڕ کرد تا وای لێ هات کە خەریك بوو نوقوم ببن

٨ کاتێ شەمعون کە بە پەتروس ناوئەبرێ ئەمەی دی چۆکی‌دادا لەبەر پێی عیسادا و ووتی : (ئەی خوداوەند بەلەمەکەم بەجێ بهێڵە ،لەبەر ئەوەی کە من مرۆڤێکی گوناهبارم . ) . ٩ پەترۆس و ئەوانەی لەگەڵیا بوون سەر-یان سوڕمابوو لە زۆری ئەو ماسی‌یانەی ڕاویان کردبوو .
١٠ هەروەها یاقوب و یۆحەنای کوڕی زەبدی شەریکی پەترۆس بوون .عیسا بە پەترۆسی‌ووت : (مەترسە لە ئێستەوە ڕاوی مرۆڤ ئەکەیت . ) ١١ دوای ئەوەی کە گەڕانەوە کەناری دەریاچەکە وازیان لە هەموو شتێ هێنا و دوای عیسا کەوتن .
١٢ کاتێ عیسا لە شارێ لە شارەکان‌بوو ،لەوێش مرۆڤێکی لێ بوو کە هەموو گیانی گولی دای‌پۆشی بوو . هەر کە عیسای دی بە ڕوودا کەوت لەبەردەمیان و لێی پارایەوە و ووتی : (ئەی گەورەم ،گەر بتەوێت توانای ئەوەت هەیە پاکم بکەیتەوە . ) ١٣ عیسا دەستی درێژ کرد و دەستی تێوەدا ،ووتی : (من ئەمەوێ ،پاك بەرەوە دەست بەجێ چاك بووەوە . ١٤ ئامۆژگاری کرد و ووتی : (کە ئەم هەواڵە بە کەس نەڵێ ،بەڵکو بڕۆ و خۆت نیشانی قەشەکان بدە ،لەباتی پاك‌بوونەوەکەشت،ئەوەی موسا فرمانی

داوە پێشکەشی‌کە،ئەمە ئەبێتە بڕوانامەیەك بۆ قەشەکان .)
١٥ هەواڵی دەنگوباسی عیسا زیاتر بڵاوبووەوە،تاوەك خەڵکێکی زۆر هاتنەلای تا گوێی لێ ڕاگرن و لەنەخۆ-شیەکانیان ڕزگاریان کات. ١٦ بەڵام ئەو دوورئەکەوتەوە بۆ شوێنە چۆڵەکان تاوەك نوێژ بکات.
١٧ ڕۆژێ لە ڕۆژان خەریکی فێرکردن بوو،لە نێوان دانیشتوانا هەندێ لە فەریسیەکان و مامۆستایانی شەریعەتی تیابوو،خەڵکی لە هەموو دێیەکانی ناوچەی جەلیل و یەهودیاوە لە ئۆرشەلیمەوە هاتبوون.توانای یەز-دان دەرکەوت بۆ چاك کردنەوەیان. ١٨ هەندێکیان مرۆڤێکی گۆجیان هێنا بە جێگەکەیەوە و ویستیان بیبەنە ژوورەوە بۆ بەردەمی. ١٩ کاتێ ڕێیان نەبوو بە هۆی زۆری خەڵکەکەوە،سەرکەوتنە سەر سەربان و شۆڕیان کر-دەوە بە جێگەکەیەوە بۆ ناوەند بۆ بەردەمی عیسا.
٢٠ کاتێ باوەڕی ئەوانەی دی،ووتی:(ئەی مرۆڤ وا گوناهەکانت بەخشرا) ٢١ نووسەرانی شەریعەت و فریسیەکان لە دڵی خۆیانا ووتیان:(بۆچی ئەم کێیە هەتا ئاوا بەم شێوەیە گوناه بکات؟ کێ ئەتوانێ گوناه

ببەخشێ تەنها یەزدان نەبێ؟ ) ٢٢ بەڵام عیسا زانی چی بیرئەکەنەوە ،وەلامی دانەوە ،ووتی : ( چی بیرئەکەنەوە لە دلّتانا؟ ٢٣ کامیان ئاسانترە ،کە بلّێم: گوناهەکانت بەخشرا یان بلّێم ،هەستەبڕۆ؟ ٢٤ بەلام ئەمەم ووت ،تاـ وەك بزانن کە کوڕی مرۆڤ لەسەر زەوی توانای گوناه بەخشینی هەیە....... ) ئینجا بە گۆجەکەی ووت: ( هەستە ،جێگەکەت هەلّگرە و بڕۆرەوە بۆ مالّەوە. )
٢٥ دەست بەجێ هەلّسا و جێگەکەی هەلّگرت و کەوتە ڕێ بەرەو مالّەوە و ستایشی یەزدانی کرد ٢٦ خەلّکەکەش هەموو سەرسام بوون و ستایشی یەزدان یان کرد ،ترس دای گرتن و ووتیان : ( ئەمڕۆ ئێمە کاری سەرسوڕ هێنەرمان دی )
٢٧ دوای ئەمە عیسا لەوێ هاتەدەرەوە ،باج گرێکی دی کە ناوی لاوی بوو ،لە ژووری باج خانەکەدا دانیشتبوو ، پێی ووت: ( دوام کەوە ) ٢٨ لاویش هەستا و هەموو شتێکی بەجێ هێشت و دوای کەوت. ٢٩ لاوی میوانـ داریەکی گەورەی بۆ کرد لە مالّی خۆی ،لەگەلّیانا هەموو باج گرە گەورەکان و خەلّکی کە دانیشتبوون لە

سەر خوان . ٣٠ نووسەرانی شەریعەت و فەریسەکان نارەزایی خۆیان دەربڕی و ووتیان : (بۆچی لەگەڵ باج‌گران و گوناەبارانا ئەخۆن و ئەخۆنەوە؟ ) ٣١ عیسا وەلامی دانەوە و ووتی : (مرۆڤی لەش ساغ پێویستی بە پزیشك نیە ،بەڵکو نەخۆش پێویستی بە پزیشك هەیە ٣٢ نەهاتووم بۆ ئەوەی بێ گوناهان بانگ کەم بۆ پەشیمان بوونەوە ،بەڵکو هاتووم بۆ بانگ کردنی گوناه‌باران ) ٣٣ ئینجا پێیان ووت : (قوتابیەکانی یوحەننا زۆر ڕۆژ و ئەگرن و نوێژ ئەکەن ،هەروەها قوتابیە فەریسەکان ،بەلام قوتابیەکانی تۆ ئەخۆن و ئەخۆنەوە . ) ٣٤ ئەمیش پێی ووتن : (ئایا ئەتوانن لە شاییا وا لە کەسوکاری زاوابکەن کە بەڕۆژوو بن ،لە کاتێکا کە زاوا لە ناویانا بێت ؟ ٣٥ بەلام ڕۆژانێك دێ کە زاوا لە نێوانیانا بەرزکرابێتەوە بۆ ئاسمان ،جا ئەوسا لەو ڕۆژانە دا بەڕۆژوو ئەبن . ) ٣٦ نموونەیەکی بۆ هێنانەوە ،ووتی ( کەس پارچە لە جلی تازە ناکاتەوە تاوەکو جلێکی کۆنی پێ پینە کات. چونکە جلە تازەکە ئەدڕێ و پارچەکەش کە وەرگیراوە لە جلە تازەکە ناگونجێ لەگەڵ کۆنەکەدا .

٣٧ دیسان کەس شەرابی تازە ناخاتە ناو کوپەی کۆنەوە ، چونکە شەرابە تازەکە کوپەکە ئەتەقێنێ ،شەرابەکە ئەڕژێ و کوپەکەش ئەشکێ. ٣٨ کەواتە پێویستە شەرابی تازە بکرێتە کوپەی تازەوە. ٣٩ کەسیش نیە شەرابی کۆن بخواتەوە و ئارەزوی تازە بکات،چونکە ئەڵێ :کۆنەکەخۆشترە.

## بەشی شەشەم

١ ڕۆژێ لە ڕۆژانی شەممە،عیسا لە نێوان دەغلێکەوە تێئەپەڕی ،قوتابیەکانی گولەگەنمیان لێ ئەکردەوە و لەبەری دەستیانا ئەیان پروان و ئەیان خوارد.
٢ هەندێ لە فەریسیەکان پێیان ووتن: (بۆچی کارێ ئەکەن کە لە شەممەدا دروست نیە؟) ٣ عیسا وەلامی‌دانەوە و ووتی: (ئەی نەتان خوێندۆتەوە کە داود و ئەوانەی لەگەلیابوون،چیان کرد کاتێ برسیان بوو؟
٤ چۆن چووە ناو مالی یەزدان و نانی پێشکەش کردنی خوارد و دای بەوانەش کە لەگەلیابوون،لەگەل ئەوەشا کە خواردنی ئەونانە ناشێ تەنها بۆ قەشەکان نەبێت؟
٥ ئینجا پێی ووتن: (کوڕی مرۆڤ خۆی گەورەی ڕۆژانی شەممەیە)
٦ لە ڕۆژێکی شەممەی کەدا،چووە شوێنی کۆبوونەوەی جولەکەکان و دەستی‌کرد بە فێرکردن.پیاوێکی لێ بوو کە دەستی ڕاستی ووشك بووبوو. ٧ نووسەرانی شەریعەت و فەریسیەکان سەیری عیسایان ئەکرد،کە بزانن ئایا لە ڕۆژانی شەممەدا خەلکی چاك ئەکاتەوە،تاوەك شتێ بدۆزنەوە،بۆ ئەوەی تاوان باری کەن. ٨ بەلام ئەو

مەبەستی زانین ،بە پیاوەکەی ووت: (هەستە و لە ناوە-
ڕاستا ڕاوەستە)ئەویش هەستا و بە پێوە لە نێوانیانا
ڕاوەستا. ٩ جا عیسا پێی ووتن: (من پرسیارێکتان
ئاراستە ئەکەم،ئایا لە ڕۆژانی شەممەدا چی دروستە،
کردنی کاری باش یان کاری خراپ؟ ڕزگارکردن یاخود
لەناوبردن کامیان باشترە؟) ١٠ دوای ئەوەی چاوی بە
هەموویانا گێڕا ،بە پیاوەکەی ووت: (دەستت درێژ کە)
ئەویش ئەمەی کرد و دەستی وەك جاری جاران چاك-
بووەوە. ١١ بەڵام بێ مێشکییان گەیشتە ئەو پلەیەی کە
بکەونە ڕاوێژ و تەگبیر لەگەڵ یەکتری کە گوایا چی
لە عیسا بکەن.

١٢ لەو ڕۆژانەدا بەرەو شاخ ڕۆیشت تاوەك نوێژ بکا
لەوێ ئەو شەوەی بە نوێژەوە بەسەر برد. ١٣ کاتێ
ڕۆژ بووەوە،قوتابیەکانی بانگ کرد ،دوانزەی لێ هەڵ-
بژاردن و ناوی نان نێرراوان ئەوانەش ئەمانە بوون:
١٤ شەمعون کە ناوی نا بە پەترۆس،ئەندەراوسی برای،
یاقوب،یۆحەننا ،فیلیپۆس،بەرسولوماوس،١٥ مەتتا ،تۆماس،
یاقوب کوڕی حەلفی ،شەمعون کە بەناوبانگ بوو بە

دلاوەر. ١٦ یەھوزا برای یاقوب لەگەڵ یەھوزای ئەسخەریوتی کە لەدوایدا بە ناپاك دەرچوو.
١٧ لەپاشانا عیسا ھاتەخوارەوە و لە گەڵیانا لە تەختاییەکدا ڕاوەستا ،خۆی و قوتابیەکانی و کۆمەڵێ لە خەڵکی ،کە لە ناوچەی یەھودیا و ئورشەلیم و سور و سەیداوە ھاتبوون. تاوەك گوییان لێی بێت و لە نەخۆشیەکانیان چاك ببنەوە. ١٨ ئەوانەش کە ڕۆحی پیسیان تیابوو چاك ببنەوە. ١٩ ھەموو ھەوڵیان ئەدا دەستیان لێی بکەوێت،چونکە توانایەکی مەزنی لێوە ئەھاتە دەرەوە و ھەمووانی چاك ئەکردەوە.
٢٠ ڕوانیە قوتابیەکانی و ووتی: (دڵشاد بن ئەی ھەژارەکان ،چونکە پادشاھێتی ئاسمان بۆ ئێوەیە ٢١ دڵشاد بن ئەی برسیەکانی ئێستا ،چونکە دوایی تێر ئەبن. دڵشاد بن ئەی چاو بە فرمێسکەکانی ئێستا ، چونکە لەدوایدا ئەکەونە شادیەوە. ٢٢ دڵشاد بن کاتێ خەڵك ڕقیان لێتان ئەبێتەوە،جیاتان ئەکەنەوە، جنێوتان پێ ئەدەن ،بە بەدکار ناوتان ئەبەن ،لە پێناوی کوری مرۆڤا. ٢٣ شادومان و دڵخۆش بن لەو

ڕۆژەدا ،چونکە پاداشتان لە ئاسمان زۆر گەورەیە .
هەر ئابەم شێوەش،باپیرانی ئەو خەڵکە بەرامبەر نێرراوانی
یەزدان ڕەفتاریان کرد .
٢٤ بەڵام خاك بەسەرتان ئەی دەوڵەمەندەکان ،لەبەر-
ئەوەی خۆشی خۆتان کرد . ٢٥ خاك بە سەرتان ئەی
تێرەکانی ئێستا ،چونکە لەپاشانا برسی ئەبن . خاك بەسەر-
تان ئەی ئەوانەی کە ئێستا قاقاپێ ئەکەنن ،چونکە
لەپاشانا ئەگرین و شین و شەپۆر ئەکەن . ٢٦ خاك بە
سەرتان کاتێ خەڵکی ستایشتان ئەکەن ،هەربەمشێوەیەش
بوو باوك و باپیرانی ئەم خەڵکە،هەڵسوکەوتیان بەرامبەر
پێخەمبەرە درۆزنەکان کرد .
٢٧ بەڵام ئەی گوێ گران ،وا پێتان ئەڵێم:دوژمنەکان-
تان خۆش بوێت،چاکە بکەن لەگەڵ ئەوانەی ڕقیان
لێتان ئەبێتەوە. ٢٨ داوای پیرۆزی بکەن بۆ ئەوانەی
نەفرەتتان ئەکەن ،نوێژ بکەن بۆ ئەوانەی خراپەتان
بەرامبەر ئەکەن . ٢٩ ئەوەی زللەیەکێ دا بە ڕوومەتتا ،
ڕوومەتەکەی تریشی بۆ ڕاگرە.گەر یەکێ چاکەتەکەی لەبەر
داکەنیت،لاری مەبە لەوەی کراسەکەشت بەرێت.

٣٠ ئەوەی داوای شتێکت لێ ئەکات،بیدەرێ ،ئەوەش کە شتێکت لێ ئەبات لێی داوامەکەرەوە. ٣١ چۆن ئەتانەوێ کە خەڵکی هەڵسوکەوتتان لەگەڵ بکەن ،لەپێشەوە ئێوە بەو شێوەیە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن. ٣٢ گەر هاتوو بەتەنها هەر ئەوانەتان خۆش ویست کە خۆشیان ئەوێن، چ چاکەیەك ئەکەن ؟تەنانەت گوناهبارانیش ئەوانەیان خۆش ئەوێ کە خۆشیان ئەوێن. ٣٣ ئەگەر کرداری باشتان هەر لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە کرداری باش بەرامبەرتان ئەکەن ،ئایا چ چاکەیەك ئەکەن؟ تەنانەت گوناهبارانیش ئەمە ئەکەن ٣٤ ئەگەر بەس بەتەنها دەستیاو بدەن بەوانەی کە ئەزانن دەستیاوەکە ئەگەڕێننەوە ،چ چاکەیەك ئەکەن؟ تەنانەت گوناهبارانیش دەستیاو ئەدەن بە گوناهبارانی کە،لەپێناوی سوود وەرگرتنا. ٣٥ بەڵام دوژمنەکانتان خۆش بوێت و کرداری چاکیان لەگەڵ بکەن دەستیاو بدە بێ ئەوەی چاوەڕوانی شتێ بکەن، چونکە پاداشتان گەورە ئەبێ و ئەبنە ڕۆڵەی یەزدان، ئەو یەزدانەی کە چاکەی بۆ بەدفەڕ و خراپەکاریش هەیە ٣٦ بە بەزەیی بن ،هەروەك کە باوکتان بە بەزەییە.

٣٧ ئەوەنە ڕەخنە لە خەڵکی مەگرن ،ڕەخنەتان لێ‌ـ
ناگیرێت،بڕیار بەسەر کەسدا مەدەن ،کەس بڕیارتان
بەسەرا نادات. لە هەڵەی خەڵکی خۆش بن ،لە هەڵەـ
تان خۆش ئەبن. ٣٨ بە خەڵکی بدەن ،پێتان ئەدرێت،
بی پێون لە کۆشتانا بە پێوانەیەکی چاکی شێلراوی
ڕاوەشێنراوی سەرانسەر کە لێی بڕژێ،چونکە بەو پێوانەـ
یەی کە بۆ خەڵکی ئەپێون بۆتان ئەپێونەوە.
٣٩ نمونەیەکی بۆ هێنانەوە ووتی: (ئایا کوێرێ ئەتوانێ
کوێرێکی کە بەڕێدا بەرێ؟ ئایا هەردووکیان ناکەونە
چاڵەوە؟
٤٠ (قوتابی لە مامۆستاکەی بەرزتر نیە،بەلام هەرکەسێ
کە تەواو ڕێك بێت،وەك مامۆستاکەی لێ دێت. )
٤١ (بۆچی سەیری پووشی ناوچاوی براکەت ئەکەیت و
ئاگاداری تەلاشە گەورەکەی ناو چاوی خۆت نیت؟
٤٢ یان چۆن ئەتوانی بە براکەت بڵێیت:ئابرا ،بیەڵە با
ئەو پووشە لە چاوت دەربهێنم لە کاتێکا تۆ خۆت تەلاشەـ
کەی ناو چاوی خۆت نابینیت؟ ئەی ساختەچی ،جارێ
تۆ یەکەم جار تەلاشەکەی ناو چاوی خۆت دەربهێنە،

ئینجا باش ئەبینیتبۆ ئەوەی پووشەکەی ناو چاوی براکەت دەربهێنیت. )
٤٣ (داری چاك نیە کە بەری خراپ بدات،داری خراپیش بەری چاك نادات. ٤٤ لەبەرئەوە هەموو دارێ بە بەرەکەیا ئەناسرێ.لە دڕك هەنجیر ناچنرێ و لە توترکیش ترێ لێ ناکرێتەوە. ٤٥ مرۆڤی باش،لە گەنجینەی باشی دلّی،چی باش بێت دەری ئەبڕێ، مرۆڤی خراپیش،لە گەنجینە خراپەکەی،چی خراپ بێت دەری ئەبڕێ،چونکە ئەوەی لەدلّ ئەڕژێ دەم پێیئەدوێ
٤٦ (باشە بۆچی بانگم ئەکەن: ئەی گەورەم،ئەی ـ گەورەم کەچی کارناکەن بەوەی من ئەیلێم؟ ٤٧ ئەوەی دێ بۆ لام،گوێ لە ووتەکانم ئەگرێت و کاری پێ ئەکات، پێتان ئەلێم کە لە کێ ئەکات. ٤٨ ئەو،لە مرۆڤێك ئەکات کە خانوویەك دروست ئەکات،زەویەکەی هەلّئەکەنێ بە قولّی،تا بناغەکەی لەسەر زەوییەکی بەردین دائەنێ ، ئینجا بارانێکی زۆر ئەبارێ و لافاو لە خانووەکەی ئەدا، بەلاّم لە شوێنی خۆی نایجولّێنێ. ٤٨ لەبەر ئەوەی لەسەر زەوییەکی بەردین دارێژراوە.

٤٩ بەڵام،ئەوەی کە گوێی لێ بوو،کاری پێ نەکرد ،ئەو لە مرۆڤێ ئەکات،کە خانووەکەی لەسەر زەوی ،بێ بناغە دروست بکات. کاتێ لافاو لە خانووەکەی ئەدا ،دەستبەجێ ئەڕوخێ ،ڕوخانێکی یەکجار خراپ. )

## بەشی حەوتەم

١ دوای ئەوەی عیسا هەموو ووتەکانی دا بە گوێی خەڵکەکەدا و تەواوی کرد ،چووە شاری کەفەرناحوم. ٢ کابرایەك کە سەرۆکی سەد کەس بوو،کۆیلەکەی نەخۆش بوو،لە سەرەمەرگ دا بوو،لای کابراش زۆر خۆشەویست بوو ٣ کاتێ بە هەواڵی عیسای زانی ،چەند پیرێکی جولەکەی ناردە لای بپاڕێنەوە لێی کە بێت و ئەو کۆیلەیەی چاك بکاتەوە. ٤ کاتێ گەیشتنە لای عیسا ،بە گەرمی داوایان لێ کرد و ووتیان: (ئەو ئەفسەرە شایانی ئەوەیە کە داواکاریەکەی جێ بەجێ بکەیت، ٥ ئەو نەوەی ئێمەی خۆش ئەوێت و شوێنی کۆبوونەوەشی بۆ دروست کردوین ) ٦ عیسا لەگەڵیان چوو. هێشتا نەگەیشتبووە نزیكماڵەکە،ئەفسەرەکە هەندێ هاوڕێی خۆی نارد کە لەسەر-

زمانیەوە پێی بڵێن : (گەورەم،ئەرك مەكێشە،من شایانی ئەوە نیم،تۆ بێیتە ژێر بنمیچیماڵەكەم،٧ دیسان من شایانی ئەوە نیم كە ڕوو بە ڕووت بمەوە. هەر لەوێوە ووشەیەك بڵێ و فەرمان بە،ئیشكەرەكەم چاك ئەبێتەوە. ٨ منیش مرۆڤێكم لەژێر فەرمانی لەخۆم گەورەتر،هەروەها سەربازیشم هەیە كە لەژێر فەرمانمان،بە یەكێ ئەڵێم: بڕۆ ئەڕوا،بەوی كە ئەڵێم: وەرە یەت،بە ئیشكەرەكەم ئەڵێم: ئەوە بكە ئەی كات.) ٩ كاتێ عیسا گوێی لەمە بوو،سەرسام بوو،ئینجا ڕووی كردە هەموو ئەوانەی دوای كەوتبوون،ووتی : (پێتان ئەڵێم،لە هەموو ئیسرائیلا باوەڕێكی مەزنی وەك ئەمەم نەدیوە) ١٠ كاتێ ئەوانەی كە ئەفسەرەكە ناردبوونی گەڕانەوە،نەخۆشەكەچاك بووبووەوە ١١ ڕۆژێ دوای ئەوە،ڕۆیشت بۆ شارێ كە ناوی نایین بوو زۆربەی قوتابیەكانی و خەڵكێكی یەجگار زۆر لەگەڵیا بوون. ١٢ كاتێ لە قەراغ شار نزیك بووەوە،تەرمێكی دی بەسەر شانەوە،ئەویش كوڕی تاقانەی بێوەژنێك بوو، خەڵكێكی زۆری ئەو شارەی لەگەڵ بوو.

١٣ كاتێ عیسا ژنەكەی دی،بەزەیی پیاهاتەوە،پێی ووت

مەگری . ١٤ ئینجا هاتە پێشەوە و دەستی لە تەرمەکە
دا ،هەڵگرانی تەرمەکە ڕاوەستان . ووتی : (ئەی کوڕی
گەنج ،بە تۆ ئەڵێم ،هەستە) ١٥ مردووەکە ڕاست بووەوو
دەستی کرد بە قسەکردن ،دایەوە دەست دایکی
١٦ خەڵکەکە هەموو ترسیان لێ نیشت،ئینجا ستایشی
یەزدانیان کرد و ووتیان : (لە نێوانمانا نێرراوێکی مەزن
دروست بوە و یەزدان بەزەیی بە گەلەکەیا هاتۆتەوە . )
١٧ ئەم هەواڵە لە هەموو ناوچەی یەهودیا و دەورو-
پشتی بڵاوبوەوە .
١٨ قوتابیەکانی یۆحەننا هەموو ئەم هەواڵانەیان بۆ
یۆحەننا برد . یۆحەنناش دووان لە قوتابیەکانی بانگ کردو
١٩ ناردینە لای عیسا ،تالێی بپرسن : (ئایا تۆی ئەوەی
کە دێت،یاخود چاوەڕوانی یەکێکیتر بکەین ؟ )
٢٠ کاتێ دوو قوتابیەکە هاتنە لای عیسا ،ووتیان :
(یۆحەننای خەڵك لە ئاوهەڵکێش ئێمەی ناردۆتە لات،
ئەپرسێ ،تۆی ئەوەی کە چاوەڕێی هاتنی ئەکرێ ،یاخود
چاوەڕوانی یەکێکیکە بکەین ؟ ) ٢١ لەو کاتەدا عیسا زۆر
نەخۆشی چاك کردبوەوە ،ڕۆحی پیسی دەرکرد بوو ،

ڕووناکی خستۆوە چاوی زۆر لە کوێرەکانەوە. ٢٢ ئینجا عیسا وەڵامی دوو نێرراوەکەی دایەوە و ووتی: (بڕۆن و هەواڵ بدەن بە یۆحەننا، لەوەی کە گوێتان لێی بوە و دیوتانە، کوێر ئەبینن و، شەلوگۆج ئەڕۆن و، گولەکان پاك ئەبنەوە، کەڕەکان ئەبیستن، مردوان زیندوئەبنەوەو هەژاران مژدەیان پێ ئەدرێ. ٢٣ شادمانن ئەوانەی گومان لە من ناکەن)

٢٤ کە نێرراوانی یۆحەننا ڕۆیشتن، عیسادەستی کرد بە دوان لەبارەی یۆحەنناوە بۆ خەڵکەکە، ووتی: (چوونە بیابان بۆ بینینی چی؟ قامیشێك کە با ئەی جوڵێنێتەوە ٢٥ ئەی چوون چی ببینن؟ مرۆڤێ بە بەرگی نایابەوە ئەوەتا ئەوانەی بەرگی نایاب ئەپۆشن و دەوڵەمەندن وان لە کۆشکی پاشاکانا. ٢٦ کەواتە چوون بۆ بینینی چی؟ پێغەمبەرێك؟ بەڵێ پێتان ئەڵێم زیاتر لە پێغەمەرێك. ٢٧ یۆحەننا ئەوەیە کە دەربارەی نووسراوە: (من لە پێشەوە ئەی نێرم نێرراوی خۆم، ئەوەی ڕێگات بۆ ئامادە ئەکات.) ٢٨ من پێتان ئەڵێم: لە نێوان ئەوانە دا کە لە مرۆڤ بوون لە یۆحەننای مەزن تر تیانیە، بەڵام

بچوکترین کەسی پادشاهێتی ئاسمان مەزن ترە لەو)
٢٩ کاتێ خەڵکەکە گوییان لە یۆحەننابوو،هەموو،تاباج-
گرەکانیش دانیان نا بە مەزنی یەزداندا و لەسەر
دەستی یۆحەننادا خۆیان لەئاو هەڵکێشابوو. ٣٠ بەڵام
فەریسیەکان و نووسەرانی شەریعەت،بە لووت بەرزیەوە
رازی نەبوون بە یاریدەی یەزدان بۆیان و خۆیان لەسەر
دەستی یۆحەننادا لەئاو هەڵنەکێشا. ٣١ ئایا ئەم
نەوەیە بەچی بەراورد بکەم؟ ئایا لەچی ئەکەن؟
٣٢ ئەوان لەو منالانە ئەکەن کە لە مەیدانی گشتیا
دانیشتوون،یەك،یەك بانگ ئەکەن و ئەڵێن:زۆرنامان بۆ
لێدان کەچی هەڵنەپەڕین،شینمان بۆ کردن کەچی
نەگریان ٣٣ یۆحەننا هات نەئەخوا و نەئەخواتەوە،
ووتتان: ئەمە شەیتانی تیایە. ٣٤ ئینجا کوڕی مرۆڤ
هات ئەخوا و ئەخواتەوە وەك هەموو مرۆڤێك،ووتتان:
(ئەمە کابرایەکی خراپ و سەرخۆشەهاوڕێی باج گران و
گوناهبارانە،٣٥ ئا بەمانە دانایی و مەزنی یەزدان
دەرناخرێ بەڵکو دانایی یەزدان بەهۆی کاری ڕۆڵە-
کانیەوە دەرئەکەوێت.)

٣٦ یەکێ لە فەریسیەکان داوای لە عیساکرد کە لە ماڵە
کەی نان بخوات. ئەویش چووە ماڵی فەریسیەکە و لەسەر
خوان دانیشت. ٣٧ لە شارەکەدا ئافرەتێکی داوێن -
پیس هەبوو، هەر ئەوەندە کە زانی وائەو لەماڵی فەریسیە-
کە دانیشتووە، هات بە قاپێ ڕۆنی بۆن خۆشەوە، ٣٨ لە-
بەر پێیا بەگریانەوە ڕاوەستا و پێکانی بە فرمێسك تەڕ
کرد و بە مووی قژی بۆی سڕی، پێی ماچ کرد و بە
ڕۆنەکە هەنوی، ٣٩ کاتێ فەریسیەکە ئەمەی دی، بەخۆی
ووت: ( گەر ئەم کابرایە بەڕاستی نێرراوی یەزدان بێت،
ئەوا ئەزانێ ئەم ئافرەتە کێیە و چیە) ٤٠ عیساوەڵامی:
دایەوە و پێی ووت: ( ئەی شەمعون، ئەمەوێ شتێکت پێ
بڵێم. ) شەمعون ووتی: ( بڵێ ئەی مامۆستا )
٤١ ئەویش ووتی: ( یەکێ لەوانەی پارە ئەدەن بەخەڵکی،
پارەی لای دوو کەس هەبوو، لای یەکێکیان پێنج دینار،
لای ئەوی کەشیان پەنجا. ٤٢ بەڵام هیچیان نەبوو کە
لەباتی بیدەنەوە، کابرا لە هەردووکیان خۆش بوو. کامیان
زیاتر کابرایان خۆش ئەوێت؟ ) ٤٣ شەمعون وەڵامی -
دایەوە: ( لەو باوەڕەدام ئەوەی کە پارە زۆرەکەی لابوو)

پێی ووت: ( بۆ چوونەکەت راستە ) ٤٤ ئینجا ڕووی کردە ئافرەتەکە و بە شەمعونی ووت: (ئەم ئافرەتە ئەبینیت من هاتمە ماڵەکەت،کەچی ئاوت نەدامێ پێمی پێ بشۆم بەڵام ئەم بە فرمێسك پێی بۆ شتم و بەقژی سەری بۆی سڕیم. ٤٥ تۆ ماچت نەکردم بەڵام ئەم لەوەتەی هاتووە لە ماچ کردنی پێم رانەوەستاوە. ٤٦ تۆ سەرمت بە ڕۆن چەورنەکرد بەڵام ئەم،بەو رۆنە گران بەها بۆن خۆشە پێی چەور کردم. ٤٧ گوناهی گەورەی ئەم ئافرەتە بەخشرا ،وانەبوایە ئاوها ئەو هەموو خۆشەویستیەی دەرنەئەبڕی. گەر گوناهی کەم ببەخشرێ ،بەهەمان شێوە دڵشادی و خۆشیە بەڵام کەمێ لەمە کەم تر. )
٤٨ ئینجا بە ئافرەتەکەی ووت: (گوناهەکانت هەمووی بەخشران. ) ٤٩ ئەوانەی دانیشتبوون ،لەدڵی خۆیانا ووتیان : ( ئا ئەمە کێیە تەنانەت گوناهیش ئەبەخشێ ؟ )
٥٠ دیسان بە ئافرەتەکەی ووت: (باوەڕ هێنانت ڕزگاری کردی ،برۆ بەدڵنیایی )

# بەشی هەشتەم

١ دوای ئەمە دەستی کرد بە گەڕان لە هەموو شار و دێهاتەکانا ،بۆ ئامۆژگاری کردن و مزگێنی دان لە بارەی پاشاهێتی ئاسمانەوە.دوانزە قوتابیەکەشی لەگەڵدا بوو. ٢ دیسانەوە چەند ئافرەتێکیشی لەگەڵا بوو کە لە نەخۆشی و ڕۆحە پیسەکان ڕزگاریان بووبوو، ئەوانەش ئەمانە بوون ،مریەم کە ناوئەبرا بە مەجدەلی ئەمەش حەوت ڕۆحی شەیتانی لێ دەرکرد بوو، ٣ یۆنا ژنی خوزی جێ گری هیرۆدس،لەگەڵ سۆسەن و زۆری کەش کە بەماڵ و سامانیان یارمەتیان ئەدا.

٤ کاتێ خەڵکێکی زۆر لەدەورووپشتی عیسا کۆبوونەوە، لەوانەی کە لە ناوچەکانەوە هاتبوون بۆ لای بە نموونە قسەی بۆ کردن و ووتی: (چێنەر هاتەدەرەوە بۆ چاندنی تۆو،لەکاتی چاندنا ،هەندێ لە تۆوەکە کەوتنە سەرڕێگا باریکەکانی ناو کێڵگەکە،پێ شێل بوون و باڵندەی ئاسمان خواردنی. ٦ هەندێکیشیان کەوتنە سەرزەوی بەردەلانی ،کاتێ سەریان دەرکرد ،ووشك بوون چونکە ئاویان نەبوو. ٧ هەندێکی کەشیان کەوتنە ناوەراستی دڕکەوە ،دڕکەکان لەگەڵیانا نەشونمایان کردوو خنکا-

نیانن . ٨ هەندێ لە تۆوەکەش کەوتە سەر زەوی چاك ، کاتێ ڕووا ،سەد ئەوەنەی خۆیان بەرووبوومیان دا . ) ئەمانەی ووتوو بانگی کرد : (ئەوەی دوو گوێی هەیە بۆ بیستن ،با گوێ بگرێ )
٩ لێرەدا قوتابیەکانی لێیان پرسی : (ماموستا مەبەست لەم نمونەیە چیە؟ ) ١٠ ئەویش ووتی :ئێوە پێتان دراوە کە نهێنی پاشاهێتی ئاسمان بزانن ،بەلام ئەوانی تر ،بە نمونە بۆیان ئەدوێم ،چونکە ئەوان سەیرئەکەن بەلام نابینن ، گوێ ئەگرن بەلام تێ ناگەن . ١١ ئەمەش مەبەستی نمونەکەیە :تۆوەکە بریتیە لە (ووشەی یەزدان . ) ١٢ ئەوەی کەوتە سەر ڕێگاباریکەکان ،ئەوانەن کە گوێ لە (ووشەی یەزدان ) ئەگرن ،ئینجا شەیتان دێت و ووشەکە لە دلیان دەرئەهێنیت،نەوەك باوەڕ بێنن و ڕزگاریان بێت ١٣ ئەوەش کە کەوتە سەر زەویە بەردەلانیەکە ،ئەوانەن کە ووشەی یەزدان بەخۆشیەوە وەرئەگرن تەنها لەکاتی بیستنیا ،ئەمانە ڕەگیان نیە ،باوەڕ ئەهێنن تا ماوەیەك ، کاتێ لەگەڵ باوەڕیانا ئەکەونە گیروگرفتەوە ،پەشیمان ـ ئەبنەوە . ١٤ ئەوانەی کەوتنە جێ دڕکاویەکە ،ئەوانەن کە

گـویـیان لـه ووشـەی یـەزدان ئـەبێت و ئـەڕۆن ،ئینجا دەردەسەری ژیان و هەولـی بەرزبوونەوە و خۆشی ژیان ئەیان خنکێنێ و هیچ بەروبوومیێکی چاك دەرنـاکـەن ١٥ بەلام ئەوانەش کە کەوتە سەر زەویە چاکەکە،ئەوانەن کە گوێ لە ووشەی یەزدان ئەگرن و لـە دڵا بـەڕێك و ڕەوانی لەبەری ئەکەن و بەهێمنی بەروبووم ئەگرن.

١٦ (خەڵکی چرا هەڵناکاو بەتەشت دای پۆشێ ،یان بیخاتە ژێر نوێنەوە بەڵکو لەسەر بەرزاییەك دای ئەنێ، تاوەك ئەوانەی دێنە ژوورەوە بە ڕووناکی ببینن.

١٧ هیچ شارەوەیەك نیە ئاشکرانەبێ ،دیسان هیچ نهێنیەك نیە نەزانرێ و نەوترێ. ١٨ کەواتە بزانن چۆن گوێ ئەگرن. ئەوەی کە هەیەتی زیاتری پێ ئەدرێ، ئەوەش کە نیەتی ،تەنانەت ئەوەش کە بەهی خۆی ئەزانێ، لێی ئەسەنرێتەوە)

١٩ دایك و برایانی عیسا هاتن بۆ لای ،بەلام لەبەر زۆری خەڵکەکە نەیان توانی بگەنە لای. ٢٠ پێیان- ووت: (دایکت و براکانت لە دەرەوە ڕاوەستاون ،ئەیانەوێ بت بینن) ٢١ وەلامی دانەوەووتی: (دایك و برام

ئەوانەن کە گوێ لە ووشەی یەزدان ئەگرن و کاری پێ ئـەکـەن . )
٢٢ ڕۆژێ لە ڕۆژان خۆی و قـوتـابـیـەکـانی سواری کەشتیەك بوون ،پێی ووتن : (با بپەڕینەوە بۆ بەری ئەوبەری دەریاچەکە ) ئەوانیش دەستیان کرد بە جولان بۆ ئەوبەر
٢٣ لەکاتێکا بەناو ئاوەکەدا ئەڕۆیشتن ،عیسـا نووسـت. ڕەشەبایەکی کوتوپڕ هەڵـی کردە سەردەریاچەکە ،کەشتیەکە پڕ بوو لە ئاو،کەوتنە بارێکی ترسناکەوە. ٢٤ چوونە لای عیسا و خەبەریان کردەوە و ووتیان : (گەورەم ،گەورەم ،وا ئێمە تیائەچین ) ئەویش هەستاو لـە ڕەشـەبا و شـەپۆلی ئاوەکە تووڕەبوو ،دەست بەجێ هەموو شتێ ئارام بووەوە و بێ دەنگ بوو. ٢٥ ئینجاپێی ووتن : کوا باوەڕتان ؟) ئەوانیش زۆر سەرسام بوون و ترسان ،یەك بە یەکیان ووت (ئەمە کێیە کەوا بە هـەواو ئـاویـش فـەرمـان ئـەدا و گـوێ ڕایـەڵـن بـۆی ؟ )
٢٦ دوای ئەمە گەیشتە شاری جەراسیین ،کـە کـەوتـۆتـە بەرامبەر ناوچەی جەلیل. ٢٧ کاتێ عیسا دابەزیە سەر ووشکانی ،پیاوێکی ئەو شارەی بینی ،کە ماوەیەکی زۆربـوو

شەیتانی تیابوو،جلی لەبەرنەئەکرد و لەخانوا نەئەژیا، ژیانی لەنێو گۆرستانا بەسەرئەبرد. ٢٨ کاتێ عیسای دی،هاواری کرد و لەبەردەمیا کەوت،بەدەنگی بەرز ووتی: (چیت لەمن ئەوێ ئەی عیسای ڕۆڵەی یەزدانی گەورە؟ لێت ئەپاڕێمەوە ئازارم مەدە) ٢٩ چونکە عیسا فەرمانی بە ڕۆحە پیسەکە دابوو،تاوەك لە پیاوەکە بێتە دەرەوە. ماوەیەکی زۆربوو دەستی بەسەراگرتبوو،هەرچەندە بەزنجیر ئەبەسترایەوە و ڕائەگیرا،بەڵام زنجیری ئەپچڕیو لەلایەن شەیتانەوە ئەبرایە چۆڵەوانی. ٣٠ عیسا لێی پرسی: (ناوت چیە؟) ووتی: (لیجیۆن) چونکەلەشکرێکی لە شەیتان تێ چوو بوو، ٣١ ئینجا شەیتانەکان لە عیسا پاڕانەوە کە دەریان نەکا و لەناویان نەبا. ٣٢ لەوناوە دا ڕانەبەرازێکی گەورە ئەلەوەڕین لە کەناری شاخێکدا، شەیتانەکان لێی پاڕانەوە کە ڕێیان بدات بچنە ناو بەرازەکانەوە،ئەویش ڕێی دان. ٣٣ شەیتانەکان لە پیاوە کە هاتنە دەرەوە و چوونە ناو بەرازەکانەوە،ئینجا ڕانە بەرازەکە کەوتنە ڕاکەڕاکە و لە کەناری شاخەکەوە هەڵ دێران بۆ ناو دەریاچەکەوە و خنکان. ٣٤ کاتێ شوانە-

کان ئەم ڕووداوەیان دی،ڕایـان کرد بۆ شـار و بۆ کێڵـگەکان تا ئەم هەواڵـە بڵاوبکەنەوە. ٣٥ خـەڵـکـەکـە هاتنە دەرەوە تا ئەوەی ڕووی داوە ببینن،هاتـن بۆ لای عیسا،ئەو پیاوەی کە شەیتانەکانی تیابوو دییان لە ـ بەر پێی عیسادا دانیشتووە بە پۆشتەیی و لەسەرخۆییەوە گـوێی گرتووە،دوای ئەمە خەڵـکەکە ترسیان لێ نیشـت. ٣٦ ئەوانەی ڕووداوەکەیان بینیبوو،بـۆ خـەڵـکـەکـەیان گـێڕایەوە،چی ڕووداوە و چۆن ئەو کابرایە چاك بۆتەوە ٣٧ ئینجا دانیشتوانی شاری جەراسیین بەگشتی،داوا ـ یان لە عیسا کرد،تاکو لایان بڕوات چونکە ترسێکی زۆر ـ یان لێ نیشتبوو،ئەویش سواری کەشـتـیـەکە بـوو تـاوەك بگـەڕێتەوە بەری ئەوبەر. ٣٨ پیاوەکەی کە شەیتانەکـانـی لێ دەرکرابوو،لە عیسا پاڕایەوەڕێی بات کـە لـەگـەڵـیا بڕوات.بەڵام ئەو ڕەوانەی کردو ووتی: ٣٩ (بگـەڕێرەوە ناو ماڵـەکەت و ئەوەی یەزدان بۆی کردی،بـیگـێـڕەوە و باسی کە )ئەویش بە هەموو شـارەکـەداگـەڕاو ئـەوەی عیسا بۆی کردبوو،ئەی گـێڕایەوە.

٤٠ کاتێ عیسا گـەڕایەوە بەری ئەوبەر،هەموو پێشوازیان

کرد ،لەبەرئەوەی هەموویان چاوەڕێی گەڕانەوەیان ئەکرد
٤١ پیاوێك کە ناوی یایرۆس بوو،سەرۆکی شوێنێك لە
شوێنی کۆبوونەوەکان بوو،هات و لەبەر پێی عیساداکەوتو
لێی پاڕایەوە کە لەگەڵیا بێت بۆ ماڵەکەی،٤٢ چونکە
تاقە کچەکەی ،کە تەمەنی دوانزە ساڵ بوو لەسەرەمەرگدا
بوو.کاتێ کە ئەڕۆی بۆ ئەوێ هەموو کۆمەڵیان لێ دابوو
٤٣ لەوێدا ژنێك هەبوو،ماوەی دوانزە ساڵ بوو خوێنی
لەبەر ئەڕۆیشت،ئەوەی کە هەیبوو دابووی بە پزیشك،
بەڵام لەسەر دەستی کەس چاك نەبوبووەوە. ٤٤ چووە
پێشەوە لە عیسا و لەدواوە دەستی دالە چمکی کراسە-
کەی ،دەست بەجێ خوێن چوونەکەی ڕاوەستا. ٤٥ عیسا
ووتی: ( کێ بوو دەستی لێ دام؟ ) کاتێ کەس دانی-
پیانەنا ،پەترۆس و هاوڕێکانی ووتیان: (ئەی گەورەم هەموو
لە دەوروپشتن و پاڵەپەستۆ ئەکەن ،کەچی تۆ ئەپرسی ،کێ
دەستی لێ دام؟ ) ٤٦ جا عیسا ووتی: (یەکێ بە
مەبەستەوە دەستی تێوەدام،چونکە هەستم بەتواناو هێزێك
کرد لێم چووە دەرەوە. ) ٤٧ کاتێ ژنەکە زانی کارەکەی
ناشاررێتەوە،بەلەرزەوە هاتە پێشەوە،چۆکی داداو لەبەر

چاوی هەمووان پێی ووت،بۆچی وە لەبەرچی دەستی لێوە داوە و چۆن دەست بەجێ چاك بۆتەوە.
٤٨ ئینجا عیسا بە ژنەکەی ووت: (ئەی ئافرەت،باوەڕت بوو کە چاکی کردیتەوە،بڕۆ بەدڵ نیایی )
٤٩ کاتێ کە عیسا قسەی ئەکرد یەکێ لە ماڵی سەرۆکی کۆمەڵگاکەوە هات،بە سەرۆکی کۆمەڵگاکەی ووت: (کچەکەت مرد ،ئیتر ئەرك مەخەرە بەر مامۆستا ) . ٥ کاتێ عیسا ئەمەی بیست،قسەی لەگەڵ کردوو ووتی : (مەترسە ،تەنها باوەڕ بهێنە،کچەکەت ڕزگاری ئەبێت) ٥١ کاتێ عیسا گەیشتە ماڵەکە،نەیهێشت کەس لەگەڵیا بێتە ژوورەوە تەنها پەترۆس و یۆحەننا و یاقوب و باوك و دایکی کچەکە نەبێت. ٥٢ خەڵکەکە ئەگریان و شین و شەپۆڕیان بۆ ئەکرد ،ئەویش ووتی : (مەگرین ئەو نەمردووە بەڵکو نووستوە ) ٥٣ خەڵکەکە پێی پێکەنین ،چونکە ئەیان زانی کە مردووە ) ٥٤ بەڵام دوای ئەوەی هەموویانی دەرکردە دەرەوەی ژوورەکەدەستی کچەکەی گرت،بانگی‌کرد و ووتی : (ئەی کیژۆڵە ،هەستە ) ٥٥ ڕۆح گەڕایەوە بۆی ،دەست بەجێ هەستا ،فەرمانیدا کە نانی بۆ بێنن .

٥٦ باوك ودايكەكە زۆر سەريان سورِ ما ؛بەلاّم راى ـ سپاردن ،ئەوەى رِووى‌داوە جارێ بەكەس نەلێن .

## بەشى نۆهەم

١ دواى ئەوە عيسا هەردوانزە قوتابيەكەى كۆكردەوە ،هێز و توانای چاك بوونەوەى دانێ بەسەر هەموو نەخۆشى و رِۆحە پيسەكانا ،٢ ئينجا ناردنى تا مزگێنى پاشاهێتى ئاسمان بدەن و نەخۆش چاك بكەنەوە . ٣ پێى ووتن : (بۆ رِێگا هيچ لەگەلّ خۆتاناهەلّ مەگرن ،نە كوتەك ،نە خواردن و نە نان ،نە پارە ،كەسيش دوودەست جل نەبا لەگەلّ خۆى . ٤ هەر مالێ چوون لەوێ بمێننەوە و هەر لەوێشەوە بكەونە رِێ . ٥ گەر هات و كەسێك لە يەكێ لە شارەكانا نەى‌ويستن ،لەوێ برِۆن و تۆزى‌پێتان بتەكێنن بۆ ئاگاهى دان لەسەريان . ) ٦ ئەوانيش گەرِان بە لاديێكانا ،مزگێنيان ئەداو نەخۆشيان لەهەموو لايەك چاك ئەكردەوە .

٧ هيرۆدسيش كە لێ پرسراوى ناوچەكە بوو ،ئەمانەى

هەموو بیستەوە ،سەری سوڕ ما ،چونکە هەندێ کەس ئەیان۔
ووت: (یۆحەننا لەناو مردوانا زیندوبۆتەوە) ٨ هەندێ
کەسیکەش ئەیان ووت: (ئیلیایەو گەڕاوەتەوە)کەسانیکەش
ئەیان ووت: (یەکێ لە نێرراوانی کۆنە و زیندوبۆتەوە)
٩ ئینجا هیرۆدس ووتی: (یۆحەننا ،من خۆم سەریم لێ ۔
کردەوە ،بەڵام ئەمە کێیە ئەم شتانەی لێ ئەبیستم؟) زۆر
حەزی ئەکرد کە بە چاوی خۆی ببینێت.
١٠ کاتێ نێرراوان گەڕانەوە ،هەموو ئەو کارانەی کردبوو۔
یان بۆ عیسایان گێرایەوە ،ئەویش بەتەنها ئەوانی لەگەڵ
خۆی برد بۆ شارێ کەناوی بەیتی سەیدا بوو.
١١ بەڵام خەڵکەکە پێیان زانی و دوای کەوتن ،ئەویش
پێشوازی کردن و باسی پاشایەتی ئاسمانی بۆ کردن ،
ئەوانەش کە نەخۆشیان هەبوو وە پێویستیان بە چاك ۔
بوونەوە هەبوو چاکی کردنەوە. ١٢ کاتێ ڕۆژ بەرەوتەواو
بوون ئەچوو ،هەر دوانزەکە هاتن و پێیان ووت: (خەڵکە۔
کە بەرێکە با بڕۆن بۆ ئەم کێڵگە و لادێ نزیکانە ،تا۔
وەك لەوێ بمێننەوە و خواردنیش بۆ خۆیان پەیدابکەن ،
چونکە ئێمە لێرەدا لە چۆڵەوانین) ١٣ ئەویش پێی ۔

ووتن : (ئێوه خۆتان بیان دەنێ با نان بخۆن ) وەڵام ـ
یان دایەوه : (لە پێنج نان و دوو ماسی زیاترمان نیـە ،
مەگەر برۆین و بۆ ئەم هەموو خەڵکه نان بکڕین . )
١٤ لەوێدا خەڵکەکه نزیکەی پێنج هەزارکەس ئەبوون ،
ئینجا بە قوتابیەکانی ووت: (کۆمەڵ کۆمەڵ دایان نیشێنن ،
با هەرکۆمەڵەی پەنجا کەس بێت. ) ١٥ ئەوانیش ئەمەیان
کرد ،هەموو دانیشتن . ١٦ عیسا پێنج نان ودووماسیەـ

کەی هەڵگرت و چاوی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوه ،ئینجا
پیرۆزی کردو دای بە قوتابیەکانی کە بیدەن بە خەڵکەکه
١٧ هەموو نانیان خواردوتێر بوون .لەدوایـدا دوانزه
سەبەته نانیشیان لێ مایەوه . ١٨ لەکاتێکا کە بە تەنها
نوێژی ئەکرد لەگەڵ قوتابیەکانا ،لێی پرسین : (خەڵکەکه
ئەڵێن من کێم؟ ) ١٩ وەڵامیان دایەوه : ( هەندێکیان
ئەڵێن یۆحەننای خەڵك لەئاوهەڵکێشیت،هەندێکی کەش
ئەڵێن ،ئیلیایت،کەسانیکەش ئەڵێن ،یەکێکی لەنێرراوانی
کۆن وزیندوبویتەوه . ) ٢٠ ئینجا لێی پرسین : (ئەی ئێوه ،
ئەڵێن من کێم؟ پەترۆس وەڵامی دایەوه : (تۆی مەسیحی

یەزدان ) ٢١ بەڵام عیسائاگاداری کردنەوەو ئامۆژگاری کردن کە جارێ ئەمە بەکەس نەڵێن ،٢٢ دیسان ووتی : ( پێویستە کوڕی مرۆڤ زۆر ئازاروئەشکەنجە بکێشێ گەورە پیاوان و سەرۆك قەشەکان و نووسەرانی شەریعەت دانی پیانەنێن و لەخاچ بدرێ و لەڕۆژی سێهەمدا هەستێتەوە . )

٢٣ ئینجا بەهەمووانی ووت: ( گەریەکێ ویستی لەدوامەوە بڕوات،با واز لەخۆی بێنێت و خاچەکەی هەموو ڕۆژێ بە کۆڵەوە بێت و دوام کەوێ. ٢٤ ئەوەی دەست بگرێ بە ژیانیەوە،ئەی دۆڕێنێ ،ئەوەش کە ژیانی لە پێناوی منا ئەدۆڕێنێ ،ئەو ئەی باتەوە. ٢٥ ئایا بەکەڵکی چی دێت،گەر یەکێ هەموو جیهان بەرێتەوە و خۆی بدۆڕێنێ؟ ٢٦ هەر کەسێ لە من و ووتەکانم شەرم بکات،ئەوا کوڕی مرۆڤیش پشت گیری لێ ناکات لە کاتێکا کە ئەگەڕێتەوە بە شکۆی خۆی و باوك و فریشتەکان و مەردمە پیرۆزەکانەوە. ٢٧ بەڵام وا پێتانی ئەڵێم بەڕاستی ،ئالێرەدا لەنێوان ئەوانەی کە ڕاوەستاون هەندێکی تیایە کەمردن بە ڕۆح ناچێژن و پادشاهی

ئاسمان بەچاو ئەبینن. . . . . . )
٢٨ نزیکەی هەشت ڕۆژ دوای ئەم ووتانە، عیسا پەترۆس و یۆحەننا و یاقوبی برد لەگەڵ خۆیا و سەرکەوتنە سەر کێوێك بۆ نوێژ کردن. ٢٩ لەکاتێکا عیسا نوێژی ئەکرد، ڕەنگی دەموچاوی گۆڕرا و جلەکانی سپی و بریسکەداربوو. ٣٠ دووان لەگەڵی ئەدووان، یەکێکیان موساو ئەوی کەشیان ئیلیابوو، ٣١ بەشکۆوە دەرکەوتن و لەبارەی ئەو خاچ کردنە دووان کە ئەوەندەی نەمابوو ڕوویدات لە ئۆرشەلیم. ٣٢ پەترۆس و دوو هاوڕێکەی لەگەڵ ئەوەشا کە خەو دای گرتبوون، بەخەبەر مانەوە تا ـ وەك مەزنی و شکۆی عیسا و ئەو دوو نێرراوەی کەشیان دی. ٣٣ لە کاتێکا کە خەریك بوو موساو ئیلیا لە عیسا جیاببنەوە، پەترۆس بە عیسای ووت: (ئەی مامۆستا، باشترنیە گەر لێرە بمێنینەوە؟ باسێ چادرتان بۆ دابنێین، یەکێ بۆ تۆ، یەکێکیش بۆ موسا، ئەوەی کەش بۆ ئیلیا. . . ) ئەمەی ووت بێ ئەوەی بزانێ چی ئەڵێ. ٣٤ کاتێ پەترۆس لەم قسانەدا بوو، هەورێ هات و کشا بەسەریانا، ئەمانیش کاتێ هەورەکە دەوروپشتی لێ گرتن، ترسان.

٣٥ دەنگێ لەناو هەورەکەوە هات و ووتی :
(ئا ئەوەتا کوڕی من ئەوەی کە هەڵبژاردەی خۆمە،
گوێی بۆ ڕابگرن . ) ٣٦ کاتێ دەنگەکە هات،قوتابیەکان
بە تەنها هەر عیسایان بینی . ئەم هەواڵەیان بە
نهێنی هێشتەوە و چیان دی بوو لەو ڕۆژانەدا بە
کەسیان نەووت .
٣٧ ڕۆژی دووایی ،کە لە کێوەکە هاتنە خوارەوە،
خەڵکێکی زۆر بەرەوپیریان هات . ٣٨ لە نێوان خەڵکەکە
دا پیاوێك دەنگی بەرزکردەوە و ووتی : (ئەی مامۆستا ،
لێت ئەپاڕێمەوە سەیری کوڕەکەم بکە ،ئەمە تاقەکوڕمە .
٣٩ ئەوەتا ڕۆحێکی پیسی تیایەو دەستی بەسەراگرتووە،
لەپڕ هاوارئەکات،ئینجا ڕۆحەکە ئەیشڵەقێنێ و کەف لە
دەمی دەرئەکا و تا نەیکوتێ بە زەویدا وازی لێ -
ناهێنێ . ٤٠ لە قوتابیەکانت پاڕامەوە کە دەریکەن ،نەیان
توانی . ) ٤١ عیسا وەڵامی‌دایەوە و ووتی : (ئەی نەوەی
بێ بڕواو لاروچەوت تاکەی لەگەڵتان بمێنمەوە و بارتان
بکێشم؟ ) بە پیاوەکەی ووت : ( کوڕەکەت بێنە ئێرە )
٤٢ لەکاتێکا کوڕەکە ئەهات،شەیتانەکە کوتای بەزەویدا و

بە توندی شلّەقانی ،دوای ئەمە عیسا ڕۆحە پیسەکەی دەرکرد ،کوڕەکە چاك بووەوە و دایەوە دەست باوکی .
٤٣ خەلّکەکە هەموو لە مەزنی یەزدان سەرسام بوون ، کاتێ خەلّکەکە سەرسام مابوون ،لە هەموو ئەو شتانەی عیسا کردی ،جا عیسا بە قوتابیەکانی ووت: ( با ئەم ووشانە بچێتە گوێتانەوە ،کوڕی مرۆڤ خەریکە بدرێتە دەستی خەلّکی ) ٤٥ بەلاّم ئەوان ئەمە تێ نەگەیشتن ، شارراوە بوو لێیان ،ترسان کە پرسیاری لێ بکەن .
٤٦ قوتابیەکانی بیری ئەوەیان لە دلّیانا ئەکردەوە کە ئایا کێ لەناویانا مەزنترە . ٤٧ عیسا بە نیازی دلّیانی زانی ،منالّێکی بچکۆلەی لای خۆیەوە راگرت و ٤٨ پێی ووتن : (هەریەکێ بە ناوی منەوە دان بەم منالّە بچکۆلە-یەدا بنێ ،ئەوا دان بەمنائەنێ ،ئەوەش کە دانم پیا ئەنێ ، دان بەوەدا ئەنێ کە ناردوومی .گەرهات و یەکێ لەناو-تانا بچوکترین تان بێت،ئەوا ئەو مەزنترینە لەناوتانا . )
٤٩ یۆحەننا دواو ووتی : (گەورەم ،یەکێکمان دی بەناوی تۆوە ڕۆحی پیسی دەرئەکرد ،ئێمەش نەمان هێشت لەبەر-ئەوەی دوات ناکەوێت لەگەلّمانا . ) ٥٠ عیساپێی ووت:

( ڕێی لێ مەگرن ،گەریەکێ بەربەرەکانی نەکردن ئەوا لەگەڵتانە )

٥١ کاتێ خەریك بوو ڕۆژانی لە خاچ دانی نزیك ببێتەوە ،بڕیاری دا کە بەرەو ئۆرشەلیم بڕوات . ٥٢ لە پێشیەوە چەند نێرراوێکی نارد ،ڕۆیشتن و چوونە لادێ یەکی سامریەکانەوە تاوەك شوێنێکی بۆ ئامادە بکەن . ٥٣ بەڵام بە پێشوازی کردنی رازی نەبوون ،چونکە بەرەو ئورشەلیم ئەچوو ٥٤ کاتێ دوو قوتابیەکەی یاقوب و یۆحەننا ئەمەیان دی ،ووتیان : ( خوداوەند ئەتەوێ داوا- کەین کە ئاگر لە ئاسمانەوە بێتەخوارەوە لەناویان بەرێ؟ ٥٥ ئەویش ئاوڕی بۆ دانەوە و ئاگاداری کردنەوە و ووتی : ( کوڕی مرۆڤ هاتووە بۆ ڕزگارکردنی ژیانی مرۆڤ نەوەك بۆ لەناوبردنی . ٥٦ ئینجا ڕۆیشتن بۆ دێیەکی کە .

٥٧ کاتێ کە بە ڕێدا ئەڕۆیشتن ،یەکێ پێی ووت: ( گەورەم بۆ هەرکوێ بڕۆیت دوات ئەکەوم ) ٥٨ عیساش پێی ووت : ( ڕێوی کونی هەیە و باڵندەی ئاسمان هێلانە ،بەڵام کوڕی مرۆڤ تەنانەت جێگەیەکی نیە سەری

بخاتەسەر. ) ٥٩ بەیەکێکی کەی ووت: (دوام کەوە ) بەلاّم
ئەمەیان ووتی: ( گەورەم ڕێگەم بدە بابڕۆم تەرمی باوکم
بنێژم ) ٦٠ عیسایش پێی ووت: ( واز لە مردوان بێنە
با مردوەکانیان بنێژن ،بەلاّم تۆ بڕۆ مزگێنی پاشاهێتی
ئاسمان بدە. ) ٦١ یەکێکی تر پێی ووت: (گەورەم ،من
لەگەلّت دێم و دوات ئەکەوم،بەلاّم ڕێگەم بدە کە یەکەم
جار لەخێزانەکەم مالّ ئاوایی بکەم) ٦٢ عیسایش پێی
ووت: ( هەرکەسێ دەست لەسەرگاسن دابنێ و ئاوڕ -
بداتەوە بۆ دواوە،بەکەلّکی پادشاهێتی یەزدان نایەت)

١ پاش ئەمە عیسا حەفتاو دوو کەسی کەی دەست نیشان کرد ،دوو دوو ناردنی ،تاوەك پێشی‌کەون بۆ هەموو شارو جێگەیەك کە خەریك بوو بۆی ئەرۆیشت. ٢ جاپێی ووتن دروێنە زۆرەبەلام کرێکارکەمە،بپارێنەوە لە یەزدانی دروێنە تا کرێکار بۆ دروێنەکە بنێرێ. ٣ برۆن ئەوامن ئەتان ـ نێرم وەك بەرخ بۆ ناو گورگ. ٤ نەکیسەی پارە لەگەڵ خۆتان بەرن نەتوێشو نە پێلاو،لەرێگاش کات بە فیرۆ مەدەن. ٥ چوونە هەرماڵێکیش،یەکەم جارسلاوکەن و بڵێن :ئاشتی لەم ماڵەبێت،٦ گەرلەماڵەکەدا ئاشتی ـ خوازی تیابێت،واشایانی ئەو ئاشتیەهەن .گەر نەشبێت ئەوا سلاوەکە بۆ خۆتان ئەگەرێتەوە. ٧ لەوماڵە بمێنەوە لەوەی کەهەیانە بخۆن و بخۆنەوە ،چونکە کرێکار شایانی ئەوەیە کە رەنجی خۆی وەرگرێ .ئەوەنە ماڵەوماڵیش مەکەن ٨ چوونە هەرشارێك و دانیشتوانی پێشوازی لێ کردن ، ئەوەی پێشکەشتانی ئەکەن بیخۆن ،٩ ئەو نەخۆشانەی تیا ـ یەتی چاکی بکەنەوە و پێیان بڵێن کە پادشاهێتی یەزدان لێتانەوە نزیکە ،١٠ لە هەرشارێکیش خەڵکەکەی نەیان ویستن ،برۆنە سەرشەقامەکانی و بڵێن :

١١ وا ئێمە تەنانەت تۆزی شارەکەشتان کە بە پێمانەوەیە ئەیتەکێنینەوە بە سەرتانا ،بەڵام ئەوە بزانن :کە پادشاهێتی یەزدان لێتان نزیك بۆتەوە، ١٢ من پێتان ئەڵێم :شاری سەدوم لەو ڕۆژەدا ناخۆشی و ئازاری کەمترە لەو شارانەی کە ئێوەی تیا دەرئەکرێن .

١٣ خاك بەسەرت ئەی کورەزین ،خاك بەسەرت ئەی بەیتی سەیدا گەر لە سور و سەیدا ئەو کارە سەر - سوڕ هێنەرانە بکرایە کە لە لای ئێوە کرا ،خەڵکەکەی هەر لە زووەوە باوەڕیان ئەهێناو ژیانیان ئەگۆڕی .

١٤ بەڵام سورو سەیدا لە ڕۆژی لێ پرسینەوەدا گیرو- گرفتیان کەمتر ئەبێ لە هەردوولاتان . ١٥ تۆش ئەی کەفەرناحوم ،ئەتەوێ بلند بیتەوە تا ئاسمان ؟ نەخێر ،تۆ ئەکەویتە خوارەوە بۆ قولایی لەناوچوون .

١٦ دیسان ووتی : ئەوەی گوێتان بۆ ڕاگرێت،گوێ بۆ من ڕائەگرێ ،ئەوەش کە دانتان پیانانێ دان بە منیشا نانێ ،ئەوەیش کە دان بە منا نانێ ،دان بەوەدا نانێ کە منی ناردوە .

١٧ دوای ئەمە هەر حەفتاو دووەکەی کە ناردبوونی زۆر

بە شادیەوە ووتیان : ( گەورەم،تەنانەت شەیتانەکانیش بە ناوی تۆوە مل کەچمانن ) ١٨ ئەویش پێی ووتن : ( شەیتانم دی وەك بروسکە لە ئاسمانەوە هەڵدێرا بۆ خوارەوە. ١٩ ئەوەتا من توانام داونەتێ کە پێ بنێن بە مارو دووپشکا و بە هێزی دوژمنا ،هەتا هەتایە هیچ شتێ ئازارتان نادات. ٢٠ بەڵام دڵ خۆش مەبن بەوەی کە ڕۆحەکان مل کەچتانن ،بەڵکو دڵ خۆش بن بەوەی کە ناوتان لە ئاسمان نووسراوە. )

٢١ لەوکاتەدا عیسا زۆر شادومان بوو بە ڕۆحی پیرۆز و ووتی : ( ئەی باوك ستایشت ئەکەم چونکە ئەم کارانەت لە داناو زانایان شاردۆتەوە و بۆ مناڵانت ئاشکرا کردوە. بەڵێ ئەی باوك لەبەرئەوەی بەلاتەوە وا باشترە )

٢٢ جا ووتی : ( هەموو شتێ لەلایەن باوکمەوە دراوە پێم،بە تەواوی کەس نازانێ کوڕ کێیە باوك نەبێ ،کەسیش نیە کە بە تەواوی بزانێ باوك کێیە کوڕ نەبێ ،ئەوەش کە کوڕ ی ئەوێ با بۆی ئاشکراکات. )

٢٣ ئینجا ئاوڕ ی دایەوە بۆ قوتابیەکانی و بە تەنها بەوانی ووت: ( خۆزگە ئەخوازرێ بە چاوتان ،بەوەی ئێوە

ئێستا ئەی‌بینن . ٢٤ من پێتان ئەڵێم،زۆر لە نێرراوانی یەزدان و زۆر لە پادشاهان ،ئاواتە خواز بوون بیبینن ئەوەی ئێوە ئێستا ئەیبینن ،بەڵام نەیان بینی ،دیسان ببیسن ئەوەی ئێوە ئێستا ئەیبیسن ،بەڵام نەیان بیست. )
٢٥ یەکێ لە زانایانی شەریعەت لێی هاتە پێشەوە ،بۆ ئەوەی تاقی بکاتەوە ،ووتی : (مامۆستا ،چی بکەم بۆ ئەوەی ژیانی هەتاهەتایی بەدەست بهێنم؟ ) ٢٦ ئەویش پێی ووت: (چی نووسراوە لە شەریعەتا چۆن ئەیخوێنیتەوە؟ )
٢٧ وەڵامی دایەوە: ( یەزدانی خۆت خۆش بوێ بە هەموو دڵت و هەموو دەرونت و هەموو توانا و بیرتەوە، ئەوەی لێت نزیکە وەك خۆت خۆشت بوێ. ) ٢٨ ئینجا پێی ووت: (وەڵامەکەت ڕاستە. گەر هاتوو کارت پێ کرد ژیانی هەتاهەتایی بەدەست ئەهێنی ) ٢٩ بەڵام پیاوەکە ویستی خۆی بە کابرایەکی باش دەرخات،دیسانەوە لە عیسای پرسی باشە کێیە ئەوەی لێم نزیکە؟ ) ٣٠ عیسا وەڵامی دایەوە ووتی : ( مرۆڤێك لە ئۆرشەلیمەوە ئەڕۆی بۆ ئەریحا ،کەوتە نێوان چەند دزێکەوە ،پارەو جلەکانیان لێ سەند و ئازاریان داو بریندارێشیان کرد ،ئینجا بە

نیوه مردویی بەجێیان هێشت و ڕۆیشتن .
٣١ وا ڕێکەوت کە قەشەیەك لە هەمان ڕێگەوە بڕوات،
بینی ،بەلام چووە بەری ئەوبەری ڕێگاکە دوور لە برین -
دارەکە و بەجێی هێشت. ٣٢ هەروەها کابرایەکی لاویش
لەوێوە تێپەڕی ،کاتێ گەیشتە ئەو شوێنە،سەیری کرد ،
ئەویش چووە بەری ئەوبەری ڕێگاکە و بەجێی‌هێشت.
٣٣ بەلام کابرایەکی سامری کە لەوێوە ئەڕۆی ،هاتەسەری ،
کاتێ بینی بەزەیی پیاهاتەوە، ٣٤ چووە پێشەوە لێی ،
دوای ئەوەی رۆن و شەرابی بەسەر برینەکانیا کرد .
بەستی . ئینجا سواری وولاخەکەی خۆی کرد و گەیاندیە
میوانخانەیەك و لەوێ چاودێری کرد . ٣٥ ڕۆژی دووەم
کاتێ میوانخانەکەی بەجێ ئەهێشت،دوو دیناری دەرکردو
دای بە خاوەن میوانخانەکە و پێی ووت: چاودێری بکە
چەندی تریشی پێویست بوو،کە گەڕامەوە ئەی‌دەم.
٣٦ جا کامیان لەم سیانە بە نزیك ئەزانی بۆ ئەوەی
کەوتە نێوان دزەکانەوە؟ ) ٣٧ وەلامی‌دایەوە: (ئەوەی بە
بەزییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ کرد و یارمەتی دا . )
ئینجا عیسا پێی ووت: (تۆش برۆ هەمان شت بکە . )

٣٨ كاتێ بە ڕێگاوە بوو چووە دێیەك،ژنێك کە ناوی مەرسا بوو پێشوازی لێ کرد و هێنایە ماڵەکەی خۆی.
٣٩ خوشکی ئەم ژنە ناوی مریەم بوو،لەبەر پێی دانیشت بۆ ئەوەی گوێ لە ووتەکانی بگرێت. ٤٠ بەڵام مەرسا کە سەرقاڵ بوو بە شت ئامادە کردنەوە بۆ میوانەکە،هاتوو ووتی: ( گەورەم سەیر ناکەیت خوشکم بەجێی هێشتووم کارەکان بەتەنها بکەم؟ پێی بڵێ با بێت یارمەتیم بدات
٤١ بەڵام عیسا وەڵامی دایەوە و ووتی: (مەرسا ،مەرساتۆ سەرقاڵ و شێواوی کاری زۆریت،کە ئەوەندە گرنگ نین.
٤٢ بەڵام پێویستی هەر یەکێکە،ئەوەتا مریەم لەوە ـ گەیشتووە و لایەنە چاکەکەی هەڵبژاردوە،ئەوەی کە لێی ناسەنرێتەوە. )

## بەشی پانزەهەم

١ عیسا لە شوێنێکا نوێژی ئەکرد ،کاتێ تەواو بوویەکێ لە قوتابیەکانی پێی ووت: (گەورەم نوێژ کردنمان فێرکە هەروەك کە یۆحەننا قوتابیەکانی فێرکرد.) ٢ ئەویش ووتی: (کاتێ نوێژ ئەکەن ،بڵێن: ئەی باوك با ناوت پیرۆز بێت،با پادشاهیەکەت بێت، ٣ نانی ڕۆژانەمان بەرێ، ٤ لە گوناهمان خۆش بە،ئێمەش لە گوناهی ئەوانە خۆش ئەبین کە هەڵەمان بەرامبەر ئەکەن ،مەمان خەرە تاقی کردنەوە.)

٥ دیسانەوە پێی ووتن: (گەر یەکێ لە ئێوە هاورێیەکی هەبێت لە نیوە شەوا بڕوا بۆ لای و پێی بڵێ هاورێم، سێ نانم بە دەستیاو بەرێ، ٦ هاورێیەکم لە دوورەوە هاتووە بۆ لام،هیچیشم نیە بیدەمێ، ٧ بەلام هاورێکەی لە دیوی ژوورەوە وەلامی باتەوە: هەراسانم مەکە دەرگام داخستووە،ئەوەتا خۆم و منالم لەناو جێگەداین ناتوانم هەستم و بتدەمێ. ٨ من پێتان ئەڵێم: گەر بێت و ئەو کەسە هەڵنەسێ بیداتێ لەبەر هاورێیەتی ،لە پاشانا هەر هەڵئەستێ و بەپێی پێویست ئەیداتێ ،لەبەر سووربوونی کابرا لەسەر داواکارییەکەی.) ٩ دیسانەوە

پێتان ئەڵێم: داواکەن ،پێتان ئەدرێ ،کۆشش کەن ، ئەیدۆزنەوە ،لە دەرگا بدەن ،لێتان ئەکرێتەوە. ١٠ هەر کەسێ داواکات دەستی ئەکەوێت ،ئەوەی کۆشش ئەکات، ئەیدۆزێتەوە ،ئەوەش لە دەرگا ئەدات لێی ئەکرێتەوە. ١١ چ باوکێ لە ئێوە گەر کورەکەی داوای نانی لێ ـ بکات ،بەردی ئەداتێ ؟ یاخود داوای ماسی لێ بکات لە باتی ماسی ماری ئەداتێ؟ یان داوای هێلکەی لێ بکات دووپشکی ئەداتێ؟

١٣ گەر بێت و ئێوەی بەد ،بزانن ئاوها بە منالەکانتان شتی باش بدەن ،کەواتە ئەبێ باوکی ئاسمانی چەند باشتر بدات پێتان؟ ئەو ڕۆحی ڕەوان ئەدا بەوانەی داوای ئەکەن؟ )

١٤ عیسا ڕۆحی پیسی دەرئەکرد لە کابرایەك کە پێی لاڵ بوو ،کاتێ شەیتانەکەی دەرکرد پیاوەکە دەستی ـ کرد بە قسەکردن ،هەموو سەرسام بوون ، ١٥ هەندێکیان نەبێ ووتیان: ( ئەو شەیتان دەرئەکات بە بەعلەزەبولی سەرۆکی شەیتانەکان. ) ١٦ ئینجا داوای نیشانەیەکی ئاسمانیان لێ کرد بۆ ئەوەی تاقی بکەنەوە. ١٧ بەلام

ئەو خوێندیەوە ئەوەی بە بیریانا ئەهات،پێی ووتـــن :
( هەر وولاتێك دوو بەرەکی تێ کەوێت وێران ئەبێت،هەر
مالێکیش ببێ بە دوو بەشەوە ئەکەوێ. ١٨ گـــەر بێتو
شەیتانەکان ئاوها بووبن بە دوو بەشەوە،ئیتر پادشا ـ
هێتیەکەیان چۆن خۆی رائەگرێ؟ ئێوە ووتتان کە مـن
بە بەعلەزەبول شەیتان دەرئەکەم،١٩ گەرمن بەو شەیتان
دەربکەم،ئایا ئەبێ نەوەکانتان بە کێ دەریان بکەن؟ با
ئەوان بڕیاربەن بەسەرتانا. ٢٠ گەر من بـــە هـێـزی
یەزدان شەیتان دەرکەم،ئەوا پادشاهێتی یەزدانـتـان
بەسەرا ئەچەسپێ. ٢١ کاتێ مرۆڤی بەهێز و توانا بە
هەموو چەکێکەوە پارێزگاری مالەکەی ئەکات،ناو مالەکەی
پارێزراوە. ٢٢ بەلام گەر یەکێ لە خۆی بەهێزتر بێتە
سەری ئەوا سەرئەکەوێ بەسەریا و ئەو چەکانەی کە پشتی
پێ بەستووە لێی ئەسەنێ،ئینجا تالانیەکەی دابەش ئەکات
٢٣ ئەوەی لەگەلما نیە،دژی منە،ئەوەش لەگەلما کۆ ـ
ناکاتەوە،بلاوی ئەکاتەوە. )
٢٤ دوای ئەوەی کە رۆحێکی پیس لە یەکێ دێتە دەرەوە،
ئەچێتە چۆلەوانی بۆ پشوودان،کاتێ هیچ نابینێ،ئەلێ

با بگەڕێمەوە بۆ ئەو ماڵەی کە بەجێم هێشت.
٢٥ کاتێ دێتەوە،ئەبینێت گسك دراوەو رازاوەیە.ئەوسا
٢٦ ئەڕوا لەگەڵ خۆیا حەوت رۆحی پیسی تر ئەهێنێ
کە خراپ ترن لە خۆی،ئەچنە ئەو مرۆڤەوە و تیا جێگیر
ئەبن،ئینجا باری ئەو مرۆڤە لە پێشو بەدتر ئەبێ.)
٢٧ کاتێ عیسا ئەمانەی ئەووت،ژنێك لەناو خەڵکەکەوە
دەنگی بەرزکردەوە و ووتی: (خۆزگە بەو سکەی کە
هەڵی گرتی و بەو مەمکەی شیری پێ دای.) ٢٨ بەڵام
ئەو ووتی: ( با خۆزگە بەوانە بخوازرێ،ئەوانەی گوێ لە
ووشەی یەزدان ئەگرن و کاری پێ ئەکەن.)
٢٩ کاتێ خەڵکێکی زۆر لێی کۆبوونەوە،ووتی: (ئەم نەوەیە
نەوەیەکی بەدە،داوای نیشانە ئەکەن،بەڵام هیچ نیشانە
یەکیان پێ نادرێت تەنها نیشانەی یونس نێرراوی
یەزدان نەبێت. ٣٠ چۆن کە یونس نیشانە بوو بۆ
دانیشتوانی نەینەوا،هەروەهاش کوڕی مرۆڤ نیشانەیە بۆ
ئەم نەوەیە. ٣١ شاژنی باشوور لە ڕۆژی دادگادا
بەرامبەر ئەم نەوەیە رائەوەستێت و تاوان باری ئەکات،
چونکە لەوپەڕی جیهانەوە هات بۆ ئەوەی لە دانایی

سلێمانی حەکیم گوێ بگرێ. وا لێرەدا لە سلێمانی
حەکیم مەزن تر راوەستاوە. ٣٢ هەروەها دانیشتوانی
ئەوسای نەینەواش لە دوارۆژا لەگەڵ ئەم نەوەیە
ڕائەوەستن و تاوان باری ئەکەن، چونکە پەشیمان بوونەوە
کاتێ ئامۆژگاری یونسیان بیست، وا لێرەدا لە یونس
مەزن تر راوەستاوە.)
٣٣ کەس چرا هەڵناکاو لە جێیەکی شارراوەدا دایبنێ،
یاخود لە ژێر جاما، بەڵکو ئەیخاتە سەر شوێنێکی بەرز،
تاکو ئەوانەی دێنە ژوورەوە رووناکیەکە ببینن.
٣٤ چاو چرای لەشە، گەر چاوت باش ببینێت لەشت
هەمووی رووناکیە، بەلام گەر چاوت تروسکایی تیا نەبێت،
ئەوا لەشت هەمووی هەر تاریکیە. ٣٥ گەر بێت و لەشت
هەمووی رووناکی بیت و هیچ لایەکی تاریکی تیا نەبێ،
٣٦ ئەوا هەمووی وەك چرایەك کە رووناکی ئەدات
ئەدرەوشێتەوە و رووناکە.)
٣٧ کاتێ کە عیسا ئەدوا، فەریسیەك داوای ئەوەی لێ -
کرد کە نانی نیوەرۆ لای ئەو بخوا. ئەویش چووە ماڵە -
کەی و لەسەر خوان دانیشت. ٣٨ بەلام فەریسیەکە

سەری سورِما لەوەی کە عیسا پێش نانەکە دەست ناشوات
٣٩ ئەویش پێی ووت: ( ئێوەی فەریسی دەرەوەی جام و قاپتان پاك ئەکەنەوە ،بەڵام ناوەوەتان پڕە لە چەتەیی و پیسی. ٤٠ ئەی بێ مێشکینە ،هەر ئەوەی دەرەوەی دروست کردووە ناوەوەیشی دروست نەکردوە؟
٤١ قاپ و قاچاغتان پڕە ئەوەی تیایەتی بی بەخشن بە هەژاران ،تاوەك لای یەزدان پاك بنەوە.
٤٢ (قوڕ بەسەرتان ئەی فەریسیەکان ئێوە دەیەکی نەعناو رازیانە و سەوزەمەنی تر بە زەکات ئەدەن ،بەڵام راستی و دادپەروەری و خۆشەویستی یەزدان پشت گوێ ئەخەن، پێویست ئەوەیە ئەمانە بەجێ بهێنن و ئەوانەی تریش لە یاد نەکەن. ٤٣ قوڕ بەسەرتان ئەی فەریسیەکان ،چونکە ئێوە حەز لە ریزی پێشەوەی کۆبوونەوەی کوڕەکان ئەکەن و ئەتانەوێ لە شوێنە گشتیەکانا سڵاوتان بەگەرمی لێ بکرێ
٤٤ قوڕ بەسەرتان ،ئێوە لەو گۆڕە وونبوانە ئەکەن کە خەڵکی بێ ئەوەی بزانن بەسەریانا ئەڕۆن. )
٤٥ ئینجا یەکێ لە زانایانی شەریعەت پێی ووت: (ئەی مامۆستا ،ئەم قسانەت ئێمەش ئەگرێتەوە. ) ٤٦ ئینجا

عیسا ووتی : ( قوڕ بەسەر ئێوەش زانایانی شەریعەت،ئێوە باری قورس و گران ئەخەنە سەر شانی خەڵکی ،بەلاّم خۆتان سەری پەنجەتانی تێوە نادەن. ٤٧ قوڕ بەسەر-تان ،چونکە ئێوە گۆڕ بۆ ئەو نێرراوانە هەڵ ئەبەستن ، کە باوباپیرتان کوشتوویانن. ٤٨ کەواتە ئێوە بەم کارە رازین بە کردەوەی باوباپیرتان ،ئەوان نێراوانیان کوشتو ئێوەش گۆڕەکانیان بۆ هەڵ ئەبەستن. ٤٩ هەر لەبەر ئەمەشە کە یەزدان ئەفەرموێ و ئەڵێ : من پێغەمبەر و نێرراویان بۆ ئەنێرم بەلاّم ئەوان لێیان ئەکوژن ودەریان ئەکەن. ٥٠ تاکو خوێنی رژاوی هەموو نێراوانی یەزدان لە سەرەتای دروست بوونی جیهانەوە بچێتە ملی ئەم نەوەیەوە، ٥١ هەر لە خوێنی هابیلەوە تا خوێنی زەکەریا کە لە نێوان شوێنی قوربانی پەرستگاکەدا کوژرا بەڵێ پێتان ئەڵێم : مافی ئەو خوێنانە لەم نەوە بێ باوەڕە ئەسێنرێ. ٥٢ قوڕ بەسەرتان ئەی زانایانی شەریعەت،چونکە ئێوە کلیلی زانیاریتان هەڵگرتووە ،بەلاّم نەخۆتان ئەچنە ژوورەوە نە ڕێ ئەدەن کە خەڵکی تر بچێتە ژوورەوە. )

٥٣ کاتێ عیسا بەم شێوەیە قسەی لەگەڵا ئەکردن، نووسەرانی شەریعەت و فەریسیەکان بە تەواوی رقیان لێ هەڵگرت،زۆر بابەتی کەیان هێنایە پێشەوە،بۆ ئەوەی لێی بدوێ، ٥٤ تاوەکو لە ووشەیەکا راوی کەن و توشی - کەن.

١ لەو کاتەدا کە خەڵکی بە هەزاران کۆبووبوونەوە ،بە جۆرێ یەك یەکی پێ‌شێل ئەکرد ،عیسا دەستی کرد بە قسەکردن بۆ قوتابیەکانی و ووتی : (یەکەم جار ئاگاداری هەویر ترشی فەریسیەکان بن ،کە بریتیە لە دوو روویی . ٢ هیچی شارراوە نیە ئاشکرا نەبێت و هیچ نهێنیەك نیە نەزانرێ . ٣ هەموو ئەوانەی لە تاریکیا ووتووتانە ،لە رووناکیا ئەبیسرێ ،ئەوەش کە لە مالاّ بە چرپە ووتووتانە ،لە سەربانەکان بانگەوازی پێ ئەکرێ . )

٤ لەبەرئەوە ئەی خۆشەویستەکانم ،مەترسن لەوانەی کە بە لەش ئەتان کوژن ،چونکە لەوە زیاتر ناتوانن هیچ بکەن . ٥ بەلاّم من پێتان ئەڵێم کە لە چی بترسن ،لەوە بترسن کە تواناداره لە دوای مردن بتانخاتە ئاگرەوە ،بەڵێ ، پێتان ئەڵێم کە لەوە بترسن . ٦ ئەوە نیە پێنج چۆلەکە بە دوو فلس ئەفرۆشن ؟ لەگەڵ ئەوەشدا یەزدان یەکێك لەوانی بیرناچێ ،٧ تەنانەت توکی سەریشتان ژمێرراوە . کەواتە مەترسن ،ئێوە بەنرخ ترن لە چۆلەکە .

٨ بەلاّم پێتان ئەڵێم ،ئەوەی کە لە بەردەم خەڵکیا دانم پیابنێ ،کوڕی مرۆڤیش لە بەردەم فریشتەکانی یەزدانا

دانی پیائەنێ . ٩ ئەوەش کە لە بەردەم خەڵکیادانم پیانانێ ،بەهەمان شێوە لەبەردەم فریشتەکانی یەزدانا دانی پیانانرێ. ١٠ ئەوەی ووشەیەك بە کوڕی مرۆڤ بڵێ لێی ئەبوررێ،بەڵام ئەوەی شتی خراپ بە رۆحی پیرۆز بڵێ ،لێی نابوررێ.

١١ کاتێ ئەتانهێننە بەردەم شوێنی کۆبوونەوەکان و لێ پرسراوان و گەورەپیاوان،گوێ مەدەن بەوەی کە چی یاخود چۆن وەڵام ئەدەنەوە. ١٢ چونکە رۆحی پیرۆز ئەیدا بە گوێتانا ئەوەی پێویستە کە بیڵێن. ١٣ ئینجا لەناو کۆمەڵەکەدا یەکێ پێی ووت: مامۆستا ،بە براکەم بڵێ ئەوەی بۆمان بەجێ ماوە بەشیکا لەگەڵما ؛ ١٤ بەڵام ئەو پێی ووت: ( ئەی مرۆڤ،کێ منی کردوە بە بەشکەر بە سەرتانا ؟ ) ١٥ بە خەڵکەکەی ووت: (ئاگاداربن و خۆتان بپارێزن لە چاوبرسێتی.گەر یەکێ سامانی هەموو جیهانیشی هەبێ ،ناتوانێ ژیانی هەتاهەتایی پێ بکرێ. ) ١٦ ئینجا نموونەیەکی بۆ هێنانەوە و ووتی : (مرۆڤێکی دەوڵەمەند زەویەکەی بەروو - بوومێکی زۆرزۆری دا بەدەستەوە. ١٧جا بیری کردەوە و

ووتی: چی بکەم کە من شوێنی تەواوم نەبێ بۆ کۆکردنە ـ
وەی بەرووبوومەکەم؟ ١٨ ووتی: وا ئەکەم، شوێنی کۆکردنە ـ
وەکانی ترم ئەروخێنم و لەوان گەورەتر دروست ئەکەم،
ئینجا لەوێدا هەموو بەرووبوومەکەم دائەنێم و کۆی ئەکەمەوە
١٩ ئەوسا بە خۆم ئەڵێم: ئەی دڵ ئەوەتا بەشی چەندین
ساڵت هەیە، کەواتە بخۆ و بخۆرەوە و هەڵپەرە.
٢٠ بەڵام یەزدان لە هەمان رۆژا پێی ووت: ئەی بێ
مێشك، هەر ئەم شەو رۆحت دەرئەچێ، بۆ کێ ئەبێ ئەوەی
کۆت کردۆتەوە؟
٢١ (ئا ئەمەیە بەشی ئەوانەی کە هەر بۆ خۆیان کۆی ـ
ئەکەنەوە و لای یەزدان هیچیان نیە)
٢٢ بە قوتابیەکانی ووت: جا لەبەرئەمە پێتان ئەڵێم، گوێ
مەدەن بە خواردن و بەوەی کە لەبەری ئەکەن.
٢٣ ژیان گرنگ ترە لە خواردن و لەشیش گرنگ ترە
لە جل. ٢٤ سەیری قەلەرەش کەن، نە ئەچنێ و نە
دروێنە ئەکات. ئازوخگەشی نیە و هیچ کۆناکاتەوە، بەڵام
یەزدان ئەیژێنێ. ئایا ئێوە لە باڵندە ئازیزتر نین؟
٢٥ بەڵام کێ لە ئێوە گەر زۆر بایەخ بدات بەم شتانە،

تەنانەت رۆژێ لە ژیانی ئەتوانێ درێژ تر بکات؟
٢٦ جا کە ئێوە تواناتان بەسەر بچوکترین شتانیە،بۆچی
بایەخ ئەدەن بە شتی تر؟ ٢٧ سەیری گوڵاڵە سوورە -
کەن،چۆن نشونما ئەکات نە هیلاك ئەبێت و نە ئەڕێسێ،
بەڵام پێتانی ئەڵێم:تەنانەت سلێمان پاشاش لەوپەڕی
مەزنیا لەبەری نەکردووە بەرگێ،جوانتر لە بەرگی گوڵاڵە
سوورە. ٢٨ گەر بێت و یەزدان ئاوا بەرگ بکاتە بەری
گژوگیالەگەڵ ئەوەی کە ئەمڕۆ لە کێڵگەدایە و بەیانی
فڕێ ئەدرێتە تەنورەوە.ئایا ئەبێ ئێوە چەند لە پێشتربن
تاوەك یەزدان لەیادتان نەکا ئەی کەم باوەڕینە ؟
٢٩ داوای ئەوە مەکەن کە چی بخۆن و چی بخۆنەوە،
مەپەشۆکێن. ٣٠ ئەمانە هەمووی بێ باوەڕەکان هەوڵی
بۆ ئەدەن،بەڵام ئێوە باوکتان ئەزانێ کە پێویستان بەمانە
هەیە. ٣١ ئێوە هەوڵ بەن بۆ چوونە پاشایەتی یەز -
دانەوە،ئەوانەی ترتان هەموو بۆ ئەبێت .
٣٢ ئەی مێگەلی بچوك،ترسی دوارۆژت نەبێ،چونکە
باوکت ئەیەوێ پاشایەتی ئاسمانت بداتێ، ٣٣ بیفرۆشن
ئەوەی کە هەتانە و بیبەخشن بە هەژاران،دروستیکەن

بۆ خۆتان لە ئاسمان سامانێ کە نافەوتێ ،گەنجێ کە لە بن نایەت،نە دز لێی نزیك ئەبێتەوە نە مۆریانە لێبی - ئەدات. ٣٤ مرۆڤ گەنجی لە هەر کوێ بێت دڵی لەوێ ئەبێت.

٣٥ با پشتێنتان بەستراو بێت و چراتان رۆشن بێت، ٣٦ وەك ئەوانە بن کە چاوەروانی گەورەکەیان ئەکەن تا لە سەر شایی بگەرێتەوە ،بۆ ئەوەی کە هاتەوە و لە دەرگای دا ،دەست بەجێ دەرگای لێ بکەنەوە. ٣٧ خۆزگە ئەخوازرێ بەو ئیشکەرەی کە گەورەکەی لەکاتی گەرانەوەدا بە بەخەبەری ئەی بینێ. راستی پێتان ئەڵێم: ئینجا گەورەکەی لەسەر خوان دای ئەنێت و قۆڵ هەڵئەکا تاوەك خزمەتی‌کات. ٣٨ دیسان خۆزگە بەبێ گەر هات و گەرانەوەی گەورەکەی لە خولی دووەم یاخود سێهەمی شەوا بێ ،ئەویش هێشتا هەر بەخەبەرە. ٣٩ بەلام ئەوە بزانن ،گەر بێت و گەورەی ماڵ بزانێت لە چ کاتێکا دز دێتە سەری ،ئەوا بەخەبەر ئەمێنێتەوە و ماڵەکەی بەجێ ناهێڵێ تا بدزرێ. ٤٠ کەواتە ئێوەش ئاوا ئامادەبن ،چونکە کوری مرۆڤ لە کاتێکا ئەگەرێتەوە

کە نایزانن. ٤١ پەترۆس لێی پرسی: (ئایا ئەم نموونانە تەنها بۆ ئێمەیە یان بۆ هەمووانە؟) ٤٢ عیسا ووتی: کێیە ئەو جێگرە دەست پاك و ژیرەی کە گەورەی ماڵ بەسەر خاوو خێزانیا دایئەنێ تاوەك خواردنیان لەکاتی خوێدا بۆ ئامادە بکات؟ ٤٣ خۆزگە ئەخوازرێ بەو ئیشکەرەی بە تەواوی بەم کارە هەڵساوە. ٤٤ راستی پێتان ئەڵێم: ئینجا گەورەی ماڵەکە ئیشکەرەکەی دائەنێ، لەسەر هەموو ماڵ و سامانێکی کە هەیەتی. ٤٥ بەلام گەر ئیشکەرەکە لە دڵی خۆیا ووتی لەوە ئەکات گەورەی ماڵ بەم زووانە نەگەڕێتەوە ئینجا هەستاو خۆی کرد بە گەورەی ماڵ و بە ئارەزوی خۆی کردی و بردی خۆی سەرخۆش کرد، ٤٦ ئەوا رۆژێ لە رۆژان کە گەورەی ماڵ ئەگەڕێتەوە، رۆژێك و کاتێك کە ئیشکەرەکە نای زانێ، بە ناپاك دای ئەنێت و دەری ئەکات. ٤٧ ئەو ئیشکەرەی داواکاریەکانی گەورەی ماڵ ئەزانێت، بەلام بە دەستی ئەنقەست کاری پێ ناکات، سزا ئەدرێ. ٤٨ ئەوەش کە داواکاریەکان نازانێت و هەڵە ئەکات، سزاکەی کەمترە.

ئەوەی زۆری پێ دراوە ،داوای زۆری لێ ئەکرێت،ئەوەش کە زۆری بەخشیوە ،داوای زۆر ئەکات.
٤٩ (من هاتووم تاکو لەسەر زەوی ئاگرێ بکەمەوە ،چەند دلـخۆشم بەوەی دەست کات بە سوتانن . ٥٠ بەلاّم لە ـ سەرمە خۆم لە ئاو هەلـکێشم ،چەندیش نارەحەتم تاوەك یەتەدی. ٥١ وا ئەزانن من هاتووم تەنها ئاشتی بێنمە سەر زەوی ؟ پێتان ئەلـێم ،نەخێر ،هێناومە لەگەلّ خۆم دووبەرەکی و جیابوونەوە. ٥٢ هەر لە ئێستەوە ،گەر لە مالـێکا پێنج کەسی تیا بێت،سیانیان لە دوانیان ،یان دوانیان لە سیانیان جیائەبنەوە. ٥٣ باوك لە کوڕ ، کوڕ لە باوك ،دایك لە کچ ،کچ لە دایك ،خەسوو لە بووك ،بووك لە خەسوو جیائەبنەوە )
٥٤ دیسان بە خەلـکەکەی ووت: (کاتێ ئێوە لە رۆژ ـ ئاواوە هەورئەبینن ،خێرا ئەلـێن :ئەم هەورە بارانی بە ـ دەمەوەیەئەمەش ئەبێت. ٥٥ کاتێکیش بای خوارووە دێت، ئەلـێن گەرما دەست پێ ئەکات،ئەمەش ئەبێت. ٥٦ ئەی ساختەچیان ،ئێوە ئەزانن رووی زەوی و ئاسمان بخوێننەوە ، ئیتر چۆن نازانن بیخوێننەوە ئەوەی لەبەر چاوتانا روو ـ

ئەدات؟ ٥٧ بۆچی خۆتان لە راستی لائەدەن؟
٥٨ کاتێ یەکێ شتێکی بەسەرتەوەیە و ئەیەوێ بت بات بۆ
دادگا،هەوڵ بە هەر لە رێگە لەگەڵیا ئاشت بیتەوە و
رێکەویت،ئەگینا ئەچیتە لای قازی و قازیش رەوانەی
بەندینخانەت ئەکات. ٥٩ پێت ئەڵێم،لەوێ نایەیتە
دەرەوە تا سزای خۆت وەرنەگریت. )

١ لەم کاتەدا ،هەواڵی ئەوەیان بە عیسا گەیاند ،کە پیلاتوس هەندێ لە پیاوانی شاری جەلیلی لە کاتی پێشکەش کردنی قوربانیەکەیانا کوشتوەو خوێنی لە خوێنی قوربانیەکانا تێکەڵاو کردوون . ٢ لێرەدا عیسا پێی ووتن (ئایا بە بیری ئێوە ،ئەو جەلیلیانە کە کوژران گوناهیان زیاتر بوو لەو خەڵکەی کە لە شاری جەلیلن ،بۆیە وایان بەسەر هات؟ ٣ من پێتان ئەڵێم: نەخێر وا نیە ،گەربێتو ئێوەش پەشیمان نەبنەوە هەمووتان ئاوها تیائەچن . ٤ یاخود ئەو هەژدە کەسەی کە قەڵای سیلوامیان بە سەرا رووخا و مردن ،گوناهبارتر بوون لە هەموو دانیشتوانی شاری ئۆرشەلیم؟ ٥ من پێتان ئەڵێم: نەخێر، بەڵام گەر ئێوەش پەشیمان نەبنەوە هەمووتان ئاوها تیا ـ ئەچن . )

٦ ئینجا ئەم نموونەیەی باس کرد : (کابرایەك لە رەزەکەیا دارهەنجیرێکی هەبوو ،هات تاکو بزانێ بەری گرتووە، سەیری کرد هیچی پێوە نیە . ٧ بانگی باخەوانەکەی کردوو ووتی: من ماوەی سێ ساڵە دێم ،تاکو لە بەرەکەی

بەرم،کەچی هیچی پێوە نابینم،هەر ئێستا بیبڕەوە
بۆچی زەویشمان لێبگرێ؟ ٨ بەڵام باخەوانەکەی ووتی:
گەورەم،ئەم ساڵیش وازی لێبێنە،زەویەکەی دەوروبەری
هەڵ ئەگێڕمەوە و کەمێ شتی بەهێزبوونی تێ ئەکەم.
٩ بەڵکو بکەوێتە بەردان،گەر نەبوو ئەوسا بیبڕەوە.)
١٠ عیسا رۆژێ لە رۆژان لە شوێنی کۆبوونەوەی جولە ـ
کەکانا خەریکی فێرکردن بوو. ١١ ئافرەتێکی لێبووماوەی
هەژدە ساڵ بوو رۆحی پیس دەستی بەسەریا گرت ـ
بوو،پشتی کۆم بووبوو،نەیئەتوانی بە رێکی راوەستێ.
١٢ کاتێ عیسا ژنەکەی دی،بانگی کرد و پێی ووت:
(ئافرەت،با رزگارت بێ لە نەخۆشیەکەت) ١٣ ئینجا
دەستی خستە سەر ئافرەتەکە،دەست بەجێ ئافرەتەکە
پشتی راست بوەوە و دەستی کرد بە ستایشی یەزدان.
١٤ بەڵام سەرۆکی کۆمەڵگاکە تووڕە بوو،بە خەڵکەکەی
ووت: (تەنها هەر شەش رۆژ لە هەفتەیەکارۆژی کارکردنە
لەو رۆژانەدا وەرن بۆ چاك بوونەوە،نەك لە رۆژی
شەممەدا) ١٥ لێرەدا عیسا وەڵامی دایەوە و ووتی: (ئەی
ساختەچیان،ئایا هەر یەك لە ئێوە،لە رۆژی شەممەندا

ناروات گاکەی یاخود گوێدرێژەکەی بکاتەوە و بیبات ئاوی بدات. ١٦ ئەوەتا ئەم ژنە کە یەکێکە لە نەوەی ئیبراهیم،ماوەی هەژدە ساڵە بەستراوی دەستی شەیتانە نابێ ئازاد بێ لە رۆژی شەممەدا؟) ١٧ کاتێ عیسا ئەمەی ووت،دوژمنانی شەرمەزار بوون،ئینجا هەموو دڵشاد بوون بە گشت ئەو کارە پیرۆزانەی کە کردی.

١٨ عیسا پرسیاری کردوو ووتی: (پادشاهی یەزدان لە چی ئەکات؟ وەك چی وایە؟ ١٩ ئەو لە تۆوێك ئەکات، کە کابرایەك هێنای و لە کێڵگەکەیا رواندی،رواو بوو بە دارێکی گەورە،بە شێوەیەك کە باڵندەی ئاسمان لەسەر لق و چڵەکانی حەسانەوە.)

٢٠ پادشاهی یەزدان لە چی ئەکات؟ ٢١ ئەو لە هەویر ترشێك ئەکات،کە ئافرەتێ هێنای و خستیە سێ بەش هەویرەوە،تاکو هەمووی هەڵ هات.

٢٢ عیسا لەم کاتەدا کە بەرەو ئۆرشەلیم ئەچوو،بە شار و لادێ کانا تێئەپەری و خەڵکی فێرئەکرد. ٢٣ یەکێ لێی پرسی: ئەی مامۆستا کەمن ژمارەی ئەوانەی رزگاریان ئەبێت؟ ئەویش رووی کردە هەموان و ووتی:

٢٤ (هەوڵ بەن لە دەرگای باریك و تەسكەوە بچنە ژوورەوە،من پێتان ئەڵێم كە زۆر كەس هەوڵی ئەوە ئەدەن بچنە ژوورەوە،بەڵام ناتوانن. ٢٥ دوای ئەوەی كە گەورەی ماڵ هەڵئەسێت و دەرگا دائەخات،بە هەزاران لە دەرەوە ئەمێننەوە،ئینجا ئەڵێن:گەورەم،لێمان بكەرەوە ئەویش پێان ئەڵێ:من ناتان ناسم ئێوە لە كوێوە هاتوون. ٢٦ ئەوساكە ئێوەش ئەڵێن:لەگەڵتا خوارد ـ مان و خواردمانەوە،لە شەقامەكانمانا قسەت بۆ ئەكردین. ٢٧ ئینجا ئەویش ئەڵێ:پێتان ئەڵێم من نازانم ئێوە كێن و لە كوێوە هاتوون،وون بن لەبەر چاوم ئەی گوناه باران. ٢٨ جا ئالەویا ئەبێت گریان و چركەچركی دان،لەوكاتەدا كە ئیبراهیم و ئیسحاق و یاقوب و هەموو نێرراوانی یەزدان ئەبینن لە پاشاهێتی یەزدانا،ئێوە دەركراونەتە دەرەوە. ٢٩ خەڵكی لە رۆژهەلات و لە رۆژئاواو سەروو خواروەوە دێن و لە پادشاهی یەزدانا دائەنیشن. ٣٠ زۆر لەوانەی دواهەمین ئەبنە یەكەمین، یەكەمینەكان ئەبنە دواهەمین.)

٣١ لێرەدا،هەندێ لە فەریسیەكان دێنە لای و پێی

ئەڵێن : (فریای خۆت کەوە راکە لێرە ،هێرۆدس بڕیاری ـ
داوە بتکوژێ ) ٣٢ ئەویش پێی ووتن : بڕۆن بەو ڕێویە
بڵێن ،کەوا من شەیتانەکان دەرئەکەم و نەخۆشەکان چاك
ئەکەمەوە ،ئەمڕۆ و بەیانی ،ئینجا لە رۆژی سێهەما ئەگەمە
ئامانجی خۆم. ٣٣ پێویستە بەردەوام بم لە رۆیشتنما ،
ئەمڕۆ و بەیانی و دووبەیانی ،چونکە کوشتنی ئەم نێرراوی
یەزدانە ،ئەبێ هەر لە ئۆرشەلیم بێت.
٣٤ (ئەی ئۆرشەلیم ،ئەی ئۆرشەلیم ،کوشتێنەری نێرراوان و
بەردباران کەری پیاو چاکانی بۆ لات هاتو ،چەند جار
ویستم منالەکانت بەیەکەوە کۆکەمەوە ،هەروەك چۆن مریشکێ
جوچکەکانی لەژێر باڵیا کۆئەکاتەوە ،بەلاّم نەتان ویست.
٣٥ پەرستگاکەتان ،تەنها داروبەردی ئەمێنێتەوە. باپێتان
بڵێم ،ئیتر نام بیننەوە ،تا ئەو کاتەی هاوار ئەکەن ،پیرۆزە
ئەوەی بە ناوی یەزدانەوە دێت. )

۱ عیسا لە ڕۆژی شەممەدا ،چووە ماڵی یەکێ لە سەرۆکی فەریسیەکان ،بۆ نان خواردن ،ئەوانەی لەوێ بوون چاو ـ یان لە عیسا نەئەتروکان و بە باشی سەرنجیان ئەدا . ۲ چونکە بەرامبەری کابرایەکی زۆر نەخۆش دانیشت بوو . ۳ عیسا ڕووی‌کردە زانایانی شەریعەت و فەریسیەکان ، ئەوانەی لەوێدا بوون ،لێی پرسین : (ئایا نەخۆش چا ـ کردنەوە ،لە ڕۆژی شەممەدا ئەشێ یان نا ؟ ) ٤ بێ دەنگ مانەوە و هیچ وەڵامێکیان نەدایەوە . ئەویش بانگی کردو چاکی کردەوە و بەرێی کرد . ٥ گەڕایەوە پرسیاری لێ کردن : (کێ لە ئێوە گوێ درێژەکەی یان گاکەی لە ڕۆژی شەممەدا بکەوێتە بیرەوە ناچێ و دەری بهێنێ ؟ ) ٦ لێرەشا نەیان توانی هیچ وەڵامێکی بەنەوە . ۷ دوای ئەوەی کە سەیری کرد ،چۆن هەندێ لە دانیشتوان ریزی پێشەوەیان گرتووە ،نموونەیەکی بۆ هێنانەوە ،ووتی : ۸ (کاتێ یەکێ بۆ سەر شایی بانگ ئەکرێ باشتروایە نەچێتە ریزی پێشەوە ،چونکە لەوانەیە ئەو شوێنە بۆ یەکێکی بەرزتر لەو دانرابێ . ۹ لە دوایـا ئـەوەی تۆ و ئەویشی بانگ کردوە ،دێت و پێت ئەڵێ :ئەو شوێنە

چۆڵکە بۆ ئەم پیاوە،تۆش تەریق ئەبیتەوە،لە دواوە ئەگەڕێت بۆ شوێنێ تیا دانیشێ. ١٠ کاتێ بانگ ـ ئەکرێیت،هەوڵبە لە دواوە دانیشە،تا ئەوەی کە بانگی ـ کردویت،بێت و پێت بڵێ: هاورێم،هەستە بڕۆرە پێشەوە، لێرەدا ڕێزت لای دانیشتوان زیاتر ئەبێ. ١١ ئەوەی خۆی بە گەورە دانێ نزمئەکرێتەوە،ئەوەش خۆی بە بچوك دائەنێ بەرزئەکرێتەوە.)
١٢ ئینجا بەوەی کە بانگی کردوە،ووتی: (کاتێ نانی نیوەرۆ یان ئێوارە ئەکەیت،هاوڕێ و براو خزم و دراوسێ پارەدارەکانت بانگ مەکە،هەتا نەوەك ئەوانیش دوایی بانگت کەنەوە و چاکەکەت بدەنەوە. ١٣ بەڵکو ئەگەر نانخواردنێکت سازکرد،هەژارو پەك کەوتەو شەل و کوێر بانگکە، ١٤ تا کارەکەت پیرۆز بێت،چونکە ئەوانە ناتوانن هەمان شتت بۆ بکەنەوە ،،ئەوسا لە ڕۆژی دوایدا پاداشتت ئەدرێتەوە.)
١٥ یەکێ لە دانیشتوان،کاتێ ئەمەی بیست ووتی: (خۆزگەم بەوەی کە لە پادشاهی یەزدانا نان ئەخوات) ئینجا عیسا ووتی: (کابرایەك خواردنێکی زۆر چاکی بۆ

ئێواره دروست کرد و خەڵکێکی زۆری بۆ بانگ کرد .
١٧ کاتی ئێواره ئیشکەرێکی نارد ،بۆ ئەوەی بە میوانەکان
بڵێ : فەرموون ،هەموو شتێ ئامادەیە. ١٨ لێرەدا هەموو
یەك لە دوای یەك داوای لێبوردنیان کرد ،یەکەمیان
ووتی : ئەمڕۆ کێڵگەیەکم کڕیوە و ئێستا ئەبێ بڕۆم بۆ
ئەوێ ،تکایە لێم ببورە. ١٩ ئەوی کەیان ووتی : پێنج
گای جووتم کڕیوە ئەمەوێ بچم بۆ لایان ،تکایە لێم ببورە
. ٢٠ یەکێکی کەشیان ووتی : خەریکی ژن داواکردنم لەبەر
ئەوە ناتوانم بێم ئیشکەرەکە گەڕایەوە و هەمووی بە گەورە
کەی راگەیاند .لێرەدا گەورەی ماڵەکە زۆر تووڕەبوو ،بە
ئیشکەرەکەی ووت: بڕۆرە دەرەوە ،بۆ شەقامی ناوشار و
کۆلانەکان ،چی هەژار و پەك کەوتە و شەل و کوێر هەیە
بانگی کە بۆ ئێره. ٢٢ پاش ماوەیەك ئیشکەرەکە
گەڕایەوە و ووتی : (گەورەم ئەوەی فەرمانت دا کرا ،
هێشتاکە شوێن ماوە. ٢٣ گەورەی ماڵ ووتی : دیسانەوە
بڕۆ بۆ رێگا و مەیانەکان بەزۆر خەڵك بێنە ماڵەوە ،تا -
وەك ماڵەکەم پڕ بێ. ٢٤ پێتان ئەڵێم: لەوانەی بانگ -
کرابوون هیچیان تامی نانی ماڵم ناکەن. )

٢٥ خەڵکێکی زۆر لەگەڵیا ئەرۆیشتن بەرێدا ،ئاوڕی بۆ دانەوە و پێی ووتن : ٢٦ (گەر یەکێ بیەوێ لەگەڵما بێت ،ئەوا پێویستە من لە هەموو شتێ گرنگتر بم لای ، تەنانەت لە دایکی و باوکی و ژن و منالی و خوشك و براشی ،بگرە لە خۆشی ،تەنها هەر بەم شێوەیە ئەتوانێ ببێتە قوتابی من . ٢٧ دیسانەوە ئەوەش کە ناتوانێ خاچەکەی هەڵگرێت و دوام کەوێت،ناتوانێ ببێتە قوتابیم ٢٨ کێ لە ئێوە گەر ویستی خانوویەك دروست کات، دانانیشێ پارەکەی بژمێرێ و بزانێ پارەی ئەوەی هەیە؟ ٢٩ نەوەك دەست کات بە کرینی شتەکان و لە دوایدا نەتوانێ تەواوی کات،ئەوساکە خەڵکی گاڵتەی پێ ئەکەن ٣٠ . ئەڵێن :ئەوە چی بوو ،دەستی بە خانوو دروست ـ کردن کرد و نەی توانی تەواوی کات؟ ٣١ یان چ پادشاهێك ،کە بیەوێ شەرکات لەگەڵ پادشاهێکی کەدا ، یەکەم جار دانانیشێت تاوەك راوێژی ئەوە بکات کە چۆن بە دە هەزار کەسەوە سەرکەوێ بەسەر بیست هەزار کەسا ، کە خەریکن بەرەو رووی ئەکشێن، ٣٢ ئەگینا خۆ تاوەك لەشکرەکە دوورە ،خێرا خەڵك ئەنێرێ بۆ رێکەوتن .

٣٣ کەواتە هەر بەم شێوەیە،گەر یەکێ ویستی دوام کەوێ پێویستە بە باشی لیێکی باتەوە و بزانێ ئایا واز لە هەموو شتێ ئەهێنێ بۆ من؟
٣٤ ( خوێ شتێکی زۆر باشە،بەلاّم کە سوێری نەما،چی سوێربێکەی بۆ ئەگەرێنێتەوە؟ ٣٥ ئەوسا بە ـ کەلّکی هیچ نایەت،نە بۆ زەوی نە بۆ بەهێز ـ کردنی زەوی،ئینجا ناچار فڕێ ئەدرێت. ئەوەی دوو گوێی هەیە،با گوێ راگرێ بۆ ئەم ووشانە. )

١ کەسانێکی زۆر لە باج گران و گوناەباران ،ئەهاتن بۆ گوێ راگرتن لە ووتەکانی عیسا. ٢ فەریسیەکان و نووسەرانی شەریعەت بەمە تووڕە ئەبوون و ئەیان ووت: (ئەم کابرایە پێشوازی لە گوناەباران ئەکات و لەگەلّیانا نان ئەخوات.) ٣ عیسا لێرەدا نموونەیەکی بۆ هێنانەوەو ووتی: ٤ کێ لە ئێوە گەر سەد سەر مەری هەبێت و دانەیەکی لێ وون ببێت،نەوەد و نۆکەی تر لە دەشت بەجێ ناهێلّێت و ناگەڕێ بە شوێن مەرە وون بوەکەدا، تا ئەی دۆزێتەوە؟ ٥ ئینجا کە دۆزیەوە،بە خۆشیەوە ئەی خاتە سەر شانی و ئەیهێنێتەوە بۆ مالّەوە،هاورێکانی و دراوسێکانی بانگ ئەکات و پێیان ئەلّێت:دلّشاد بن لە گەلّما چونکە ئەو مەرەی کە وون بوو،دۆزیمەوە. ٧ من پێتان ئەلّێم هەر ئا بەم شێوەیەش،لە ئاسمان ئەبێ بەشادی گەر یەکێ لە گوناەباران بگەڕێنەوە بۆ سەر رێگەی یەزدان،زیاتر لە نەوەد و نۆ کەسی بێ گوناه کە پێویستیان بە گوناه پاکردنەوە نیە.

٨ یان چ ئافرەتێ گەر دە پەنجایی هەبێ و یەکێکیانی لێ بکەوێت،هەلّ ناسێ و چرا هەلّ ناکاو دەست ناکات

بە گەسك دانی ماڵەکە بە ووردی،تا ئەی دۆزێتەوە؟
٩ کاتێ کە دۆزیەوە،بۆ هاورێ و دراوسێکانی ئەگێڕێتەوە و پێان ئەڵێ:دڵشاد بن لەگەڵم چونکە پارە وون بوەکەم دۆزیەوە. ١٠ من پێتان ئەڵێم:هەر بەم شێوەیە،بە گەڕانەوەی گوناەبارێ لەرێی گوناە،ئەبێتە شادی لە نێوان فریشتەکانی ئاسمانا.
١١ ئینجا ووتی:کابرایەك دوو کوری هەبوو.
١٢ بچووکەکەیان بە باوکی ووت:باوکە،چیم بەرئەکەوێ لە بەشی خۆم بمدەرێ،کابراش چی سامانی هەبوو کردی بە دوو بەشەوە و بەشێکی دانا بۆ کورە بچووکەکەی.
١٣ دوای چەند رۆژێ،کوری بچووك چی هەبوو هەمووی کۆکردەوە،ئینجا کەوتە رێ بۆ وولاتێکی دوور، لەوێ چی هەبوو هەمووی لە رابواردنا خەرج کرد.
١٤ کاتێ کورە هیچی بەدەستەوە نەما،گرانی کەوتە ئەو ناوچەیەوە،ئینجا هەستی بەوە کرد کە پێویستی بە شتێ هەیە پێی بژی. ١٥ دوای ئەوەی چووە لای کابرایەك لە دانیشتوانی ئەو شارە،کابرا ناردی بۆ کێڵگەکەی تاوەك بەرازەکانی بۆ بلەوەڕێنێ. ١٦ برسێتی وای لە

کوره کرد که خواردنی بەرازەکان بخوات،ئەوەشی بە تەواوی دەست نەکەوت.
١٧ ئینجا کەمێ بیری کردەوە و ووتی: ئاخۆ چەند نان بمێنێتەوە ،لەبەر ئەو کەسانەی لای باوکم ئیش ئەکەن ،ئەوەتا منیش لێرەدا خەریکە ئەمرم لە برسا. ١٨ با هەستم بگەڕێمەوە بۆ لای باوکم،پێی ئەڵێم: بابە من بەرامبەر بە ئاسمان و بەرامبەرت هەڵەم کرد، ١٩ ئیتر من شایانی ئەوە نیم بە کوری تۆ بانگ کرێم،بمکە بە یەکێ لەوانەی کە ئیشت بۆ ئەکەن. ٢٠ کوره هەڵساو گەڕایەوە بۆ لای باوکی ،کاتێ باوکی لە دوورەوە دی ،دڵی پێی سووتا و رایکرد بۆ لای و دەستیکردە ملی و بە گەرمیەوە ماچی کرد. ٢١ ئینجا کوره پێی ووت: بابە من بەرامبەر ئاسمان و بەرامبەرت هەڵەم کرد ،ئیتر من شایانی ئەوە نیم بە کوری تۆ بانگ کرێم..... ٢٢ بەلام باوکەکە، بانگی ئیشکەرەکانی کرد و ووتی: برۆن خێرا باشترین جل و بەرگ بێنن و لەبەری کەن ،موستیلەی بکەنە دەست و پێڵاو بکەنە پێی. ٢٣ ئینجا برۆن گوێرەکە دابەستەکەش سەربرن ،تا بیخۆین و ئاهەنگ بکەین. ٢٤ ئەم کورەم

مرد بوو،زیندوبۆتەوە،وون بوو بوو،دۆزراوەتەوە،ئینجا کرد یان بە ئاهەنگ و خۆشی.
٢٥ کوری گەورەی کابرا،دوای ئەوەی لە کێڵگە گەڕایەوە و نزیك ماڵەوە بوەوە،گوێی لە مۆسیقا و هەڵپەرکێ بوو. ٢٦ یەکێ لە ئیشکەرەکانی بانگ کرد و لێی پرسی ئەوە چیە،چی رووداوە؟ ٢٧ وەڵامی دایەوەو ووتی:براکەت گەڕاوەتەوە،باوکیشت گوێرەکە دابەستووەکەی سەربڕیوە بۆی،چونکە بە زیندویێتی گەڕاوەتەوە.
٢٨ لێرەدا برای گەورە توورە بوو،نەیویست بچێتە ژوورەوە. باوکی هاتە دەرەوە و لێی پاڕایەوە.
٢٩ بەڵام ئەو وەڵامی باوکی دایەوە و ووتی:ئەوەتا من ئەو هەموو ساڵە ئیشت بۆ ئەکەم،بەرهەڵستی هیچ فەرمانێکم نەکردویت،تەنانەت بزنێکیشت نەدامێ تاوەك لەگەڵ هاورێکانما ئاهەنگێکی پێ بکەم. ٣٠ بەڵام ئەوەتا بۆ گەڕانەوەی کوڕەکەت،ئەوەی بە رابواردن نیوەی سامانی خواردی،گوێرەکەی دابەستراوی بۆ سەرئەبڕی.
٣١ ئینجا باوکەکە پێی ووت:(کورم،تۆ گشت کات لە ـ گەڵمایت،ئەوەی هەمە هی تۆیە،بەڵام پێویستە دڵشاد

بین ،چونکە براکەت مرد بوو زیند وبۆتـەوە ،وون بـوو بـوو دۆزراوەتـەوە . )

## بـەشـی شـانـزەهـەم

١ دیسانەوە عیسا بە قوتابیەکانی ووت: (یـەکێ سـەر ـ پەرشتی کاروباری کـابـرایـەکـی دەولـەمەندی ئـەکـرد و داراییەکەی بۆ ئەبرد بەرێوە ،تاوان بـار کـرا بـەوەی کـە دەست بڵاوی ئەکات. ٢ کـابـرای دەولـەمەند بانگـی ـ کرد و لێی پرسی :ئەمە چیە ئەی‌بیسـمـەوە لـێـت؟ بـڕۆ حسابەکانت بکە و بیخەرە بەردەستم ،ئیتر نـامـەوێ سەر ـ پەرشتی کارم بکەیت. ٣ کابرا لە دلـی خـۆیـا ووتـی : باشە ئیتر من چی بکەم ،دوای ئەوەی ئەم ئیشەم نامێنێ؟ نە ئەتوانم زەوی بکێلـم ،نە سوالـیشم پێ ئەکرێ ٤ بـەلام خۆم ئەزانم چی ئەکەم ،هاورێییەکی زۆر بۆ خۆم پەیا ئەکەم، تا ئەگـەر دەرکرام ئەوان یارمەتیم بەن . ٥ چوو قەرزارە ـ کانی کابرای دەولـەمەندی یـەکـە یـەکـە بانـگ کرد . لە یەکەمیانی پرسی :چەند قەرزاری؟ ٦ وەلامـی دایـەوە :

سەد تەنەکە رۆن. ئینجا پێی ووت: قەیناکە تەنـها پـەنجا تەنەکە ئەنووسم. ٧ لەوی کەی پرسی: ئـەی تـۆ چـەنـت لەسەرە؟ ووتی: سـەد فەردە گـەنم. پێی ووت: ئەوا هەشتا فەردەت بۆ ئەنووسم. ٨ لـە دوایـدا کـاتـێ کـابـرای دەولـەمەند بەمەی زانی، ئافەرینی لە ئـیشـکـەرەکەی کـرد، چونکە بۆ داهاتووی خۆی بە ژیرانە بیری کردبوەوە. لـە راستیا ئەو مرۆڤانەی کە ئـەم جـیـهـانـەیان هەڵـبژاردوە، لێزان ترن بۆ ژیانی سەر زەویـان لـەوانـەی رۆژی دواییان هەڵـبژاردوە. ٩ ئینجا عیسا پێیان ئـەڵـێت: ئێوەش ئاوها لێزان بن، وەك ئەو کابرایە، بۆ بەکارهێنانی پارەتان، یارمەتی ئەوانەی پێ بەن کە پێویستیان بە یارمە تیتان هەیە، تا ئەگەر پارەتان نەما لەلایەن یـەزدانـەوە یارمەتی بدرێن و لـە ئـاسـمـانـا جـێتـان بـکـرێـتـەوە. ١٠ ئەوەی لە کەما دەست پاك بێت، لە زۆریشا دەسـت پاکە ئەوەش لە زۆرا ناپاکە، لە کەمیشا ناپاکە. ١١ گـەر ئێوە سەر راست نەبن لە پارەیەکا کە دنیاییە، ئیتر چـۆن گـەنجینەی ئاسمانیتان بخرێتە بەردەست؟ ١٢ یان گـەر ئێوە سەرراست نەبن لە ماڵێکا کە هی خـەڵـکیە، ئیتـر

چۆن یەزدان شتێکتان بداتێ کە ئەبێت بە هی خۆتان
١٣ هیچ ئیشکەرێ ناتوانێ مل کەچی دوو گەورە بێت:
مسۆگەر یەکێکیانی لەوی کە زیاتر ئەوێت،یان ئەچێتە لای
یەکێکیان و ئەوی کە بەجێ ئەهێڵێ. بەم شێوەیە ئێوەش
ناتوانن،لە هەمان کاتدا ملکەچی یەزدان و پارەش بن
١٤ فەریسیەکان کە زۆر پارەیان خۆش ئەویست،دوای
ئەوەی گوییان لەمانە هەمووی بوو،پێی پێ کەنین.
١٥ ئینجا عیسا پێی ووتن:ئێوە خۆتان لای خەڵکی بە
پاك دەرئەخەن،بەڵام یەزدان دڵتان باش ئەناسێ.
ئەوەی خەڵك بە خاوەن پایەی دائەنێ،لای یەزدان بێ
پایەیە.
١٦ تاکو هاتنی یۆحەننای خەڵك لەئاوهەڵکێش،یاسای
موسا و ووتەی نێرراوانی یەزدان،پێوانە بوون بۆ هەڵسو
کەوت.ئینجا ئەوەتەی باسی پادشاهی یەزدان و
پادشاهی ئاسمان ئەکرێت،هەموو کەسێ هەوڵ ئەدات
بۆی. ١٧ بەڵام ئەمە لە یاد مەکەن،نەمانی زەوی و
ئاسمان زۆر ئاسانترە،لە لابردنی خاڵێ لە خاڵەکانی
یاسا.

١٨ ئەوەی ژنەکەی تەڵاق ئەدات و یەکێکی کە ئەهێنێ، بێ هۆی داوێن پیسی، ئەوا داوێن پیسی ئەکات. ئەوەش کە تەڵاقدراوێك ئەهێنێ دیسانەوە داوێن پیسی ئەکات.
١٩ کابرایەکی زۆردەوڵەمەند هەبوو، هەموو، رۆژێ خەریکی ئاهەنگ گێران بوو، گران بەهاترین و جوانترین جلی لەبەرئەکرد. ٢٠ کابرایەك کە ناوی لەعاز بوو، لەبەر دەرگاکەیا کەوتبوو، برین لێی دابوو. ٢٠ لەو بەرماوەیەی ئەخوارد کە فرێ ئەدرایە بەر دەرگا. زۆر جاریش سەگ ئەهاتن و زمانیان ئەهێنا بە برینەکانی لەشیا.
٢٢ کابرای هەژار مرد و چووە لای ئیبراهیمی نێرراوی یەزدان، پاشان کابرای دەوڵەمەندیش مرد، ٢٣ کاتێ سەری هەڵبری، سەیری کرد ئەوا لە دۆزەخایە و ئازار ئەچێژێ. لە دوورەوە ئیبراهیمی دی لەگەڵ ئەو لەعازەی کە هەموو رۆژێ لەبەر دەرگاکەی کەوتبوو. ٢٤ ئینجا هاواری کرد: ئەی ئیبراهیمی باوك، بەزەیت پیا بێتەوە، لەعاز بنێرە تا پەنجەکانی بەئاو تەڕ کات و سەری زمانمی پێ ساردکاتەوە، ئەوەتا لەم ئاگرەدا ئازارم زۆرە.
٢٥ بەڵام ئیبراهیم پێی ووت: کورم، لە بیرتە کە تۆ چی

خۆشی هەیە هەموویت کرد و دیت،لەعازیش چی دەردی سەری هەبوو بینی.بەڵام ئەوەتا ئێستا ،ئەو دڵنەوایی ئەکرێت و تۆش ئازارئەچێژیت. ٢٦ سەرەرای ئەمانە هەموو،لە نێوانمانا بۆشاییەکی گەورە هەیە و دانراوە، ئەوەی بیەوێ لێرەوە بێتە لاتان ناتوانێت،هەمان شت ئەوەش کە ئەیەوێ لای ئێوەوە بێتە لامان ناتوانێت.
٢٧ ئینجا کابرا ووتی:کەواتە لێت ئەپارێمەوە بینێرە بۆ ماڵی باوکم، ٢٨ لەوێ پێنج برام هەیە،تاوەك ئاگادار-یان بکاتەوە،نەوە ئەوانیش بێنە ئەم دۆزەخەوە. ٢٩ بەڵام ئیبراهیم پێی ووت:ئەوان موسا و نێرراوانی یەزدانیان هەیە،دەبا گوییان بۆ راگرن. ٣٠ ئەمیش پێی ووت: نەخێر،ئەگەر یەکێ لەناو مردوانەوە چوو بۆ لایان،ئیتر باوەرئەکەن. ٣١ کە ئەوان باوەریان بە موسا و نێرراوانی یەزدان نەکرد،ئەوا باوەر بە مردوی زیندو-بوەوەش ناکەن.

١ ئینجا عیسا بە قوتابیەکانی ووت: (کۆسپ و گیروگرفت هەر دێتە ڕێتان،بەڵام قوڕ بەسەر ئەو کەسەی کە بۆتانی دروست ئەکات. باشترپکە گەر ئەو کەسە،بەرد بکرێتە ملی و فڕێ بدرێتە دەریاوە،لەوەی ببێتە کۆسپ و گیروگرفت بۆ ئەمانەی وەك منالێکی پاك باوەڕم پێ - ئەکەن. ٣ ئاگاداری خۆتان بن،گەر براکەت هەڵەی کرد،گلەیی لێ بکە،کە پەشیمان بووەوە،لێی ببورە. ٤ ئەگەر لە رۆژێکا حەوت جار هەڵەی بەرامبەر کردبێت و هەر حەوت جارەکەش پەشیمان بوەوە و ووتی: من پەشیمانم،تۆ لەسەرتە لێی ببوری.)

٥ ئینجا قوتابیەکان بە عیسایانووت: (فێرمان کە، باوەڕمان بەهێزکە.) ٦ بەڵام عیسا پێیووتن: ئەگەر تەنها ئەوەندەی دەنکە خەرتەلەیەك باوەڕتان هەبوایە،بە دارتووتان ئەووت هەڵکەنرێ لەو زەویە و بڕۆرە ناو دەریاوە ئەوسا ئەویش بە قسەی ئەکردن.

٧ کێ لە ئێوە گەر ئیشکەرێکی هەبێ و خەریکی کاری کێڵگە و لەوەڕاندن بێت،دوای ئەوەی کە ئەگەڕێتەوە، پێی ئەڵێ: وەرە سەرخوان یەکسەر؟ ٨ ئایا پێی ناڵێ

شتێکم بۆ بێنه با نانی ئێواره بخۆم،دان به خۆتا بگره
بەردەستیمکه تا له نانەکەم ئەبمەوه.ئینجا نۆرەی تۆ دێت
بۆ خواردن و خواردنەوه. ٩ ئایا پێویستی سەر شانه،
سوپاسی تایبەتی ئیشکەر بکرێ کاتێ کارێکی سەر شانی
خۆی جێبەجێ ئەکات؟ ١٠ ئێوەش بەم شێوەیه،کاتێ
ئەوەی فەرمانتان پێدراوه ئەیکەن،بڵێن ئێمه ئیش ـ
کەرین و کاری سەرشانی خۆمان،جێبه جێ،کردووه.
١١ کاتێ عیسا بەرەو ئۆرشەلیم ئەچوو،به سنووری
ناوچەی سامیره و جەلیلا رۆیشت. ١٢ که چووه دێیه له
دێیەکانی ئه ناوچەیه،دە پیاوی دی که تووشی
نەخۆشی گەری بووبوون.پیاوەکان دووربەدوور راوەستان،
١٣ دەنگیان بەرزکردەوه و ووتیان:(ئەی عیسا ئەی
مامۆستا،بەزەیت پیامانا بێتەوه.) ١٤ ئەویش بینینی و
پێی ووتن:(برۆن و خۆتان پیشانی قەشەکان بەن که
ئێوه پاك بوونەتەوه)کاتێ که رۆیشتن بۆ ئەوێ له رێ
چاكبوونەوه. ١٥ یەکێ لەوانه که سەیری خۆی کرد وا
چاكبۆتەوه و برینی پێوه نەماوه،گەرایەوه بۆ لای عیسا و
به دەنگیبەرز ستایشی یەزدانی کرد،١٦ لەبەرپێیا

کەوت و سوپاسی کرد .ئەم کابرایەش یەکێ بوو لە سامریە
کان. ١٧ ئینجا عیسا ووتی: (ئایا ئەوانەی چاكبوونەوە
دە کەس نەبوون ،کوا نۆکەی کە؟ ١٨ کەسیکە نەبوو لەوانە
کە بگەڕێتەوە و سوپاسی یەزدان بکات تەنها کابرایەکی
نامۆ نەبێت؟) ١٩ دوای ئەمە پێیووت: (هەستە،برۆ بە
رێگەی خۆتەوە باوەرت بوو ئەوەی چاکیکردیتەوە.)
٢٠ کاتێ فەریسیەکان لێیان پرسی: (پادشاهی ئاسمان
کەی دێت؟)وەلامیدانەوە و ووتی: (پادشاهی ئاسمان
شتێ نیە کە بەچاو ببینرێ،٢١ کەس ناتوانێ بەپەنجە
نیشانی داو بلێ ئەمەتا یان ئەوەتا،پادشاهی ئاسمان
ئەتوانێ لە ئێستەوە لە ناوەرۆکتانا دەست پێ -
بکا و دروست بێت.)

٢٢ ئینجا بە قوتابیەکانی ووت: (رۆژێك دێت،ئارەزووی
ئەوە بکەن ،گەر تەنها بۆ رۆژێکیش بووە کوری لە مرۆڤ
لەدایك بوو ببینن ،بەلام نایبینن. ٢٣ ئینجا هەندێ
هەن کە پێتان ئەلێن ،ئەوەتا لەوێیە یاخود وەرن ئەمەتا
لێرەیە ،مەڕۆن و دوایان مەکەون. ٢٤ وەك بروسکە کە
چۆن لە ئاسمانا ،گەر لە لایەکەوە بێت،لاکەی کەش

رووناك ئەكاتەوە و ئەبینرێ ،هـاتـنـەوەی کوڕ ی لە
مرۆڤ لەدایك بووش بـەو شێـوەیـە ئـەبێـت. ٢٥ بەڵام
پێویستە جارێ پێش ئەوە ،زۆر ئازار بکێش و لەلایەن ئـەم
نەوەیەوە وەرنەگیرێ. ٢٦ چـی لـە سـەردەمی نـوحـا
روویدا ،هەمان شت لە سەردەمی کوری لـە مرۆڤ لـە
دایك بووا رووئەدات. ٢٧ ئەوە بوو خـەڵـكی خـەریكی
خواردن و خواردنەوە و شـووکـردن و ژن هـێـنـانـی
خۆیان بوون ،تا ئەو رۆژەی کە نوح چووە ناو کەشتیەکەوەو
باران دەستی پێکرد و هـەموویـانـی لـەنـاوبـرد .
٢٨ دیسان وەك سەردەمی لوت،کـە خـەڵـكی هـەموو
خەریکی خواردن و خواردنەوە و کـڕیـن و فـرۆشتـن و
چاندن و ماڵ دروست کـردن بـوون، ٢٩ بـەڵام لـەو
رۆژەی کە لوت لە شاری سەدووم چووە دەرەوە ،یـەزدان
ئاگر و گۆگردی لـەئـاسـمـانـەوە بـەسـەر شـارەکـەیـانـا
باران و هەمووی لەناوبردن ، ٣٠ لە گـەڕانەوەی کوری لە
مرۆڤ لەدایك بووشا هەمان شت رووئەدات.
٣١ ئەوەی لەو رۆژەدا لەسەر سەربانە،پـێـویـسـت نـاکات
راکاتە خوارەوە بۆ هـێـنـانـی شتـەکـانـی. ئـەوەش کە لە

کێڵگەکەدا کارئەکات ئیتر پێویست ناکات بگەڕێتەوە بۆ
ماڵەوە. ٣٢ بیهێننەوە بەرچاوی خۆتان ،ئەوەی بەسەر
ژنەکەی لوتا هات. ٣٣ ئەوەی خۆی ئەبەستێ بە
ژیانی دنیاوە ،ژیانی خۆی ئەدورێنێ ،ئەوەش کە ژیانی
ئەخاتە بەردەستی یەزدان ،ژیانی هەتاهەتایی ئەباتەوە.
٣٤ پێتان ئەڵێم: رێ ئەکەوێ لە کاتی گەڕانەوەما ،دوو
کەس کە لە جێگایەکا خەوتوون ،یەکێکیان ببرێ و ئەوی -
کەیان بەجێبمێنێ ، ٣٥ یان دوو ژن کە بە یەکەوە
دەستار ئەکەن ،یەکێکیان ئەبرێ و ئەوی کەیان بەجێ -
ئەمێنێ. ٣٦ هەروەها دوو کەس کە لە کێڵگەیەکا بە -
یەکەوە کارئەکەن ،یەکێکیان ئەبرێ و ئەوی کەیان بەجێ -
ئەهێڵرێ.) ٣٧ چۆن کاتێ لە ئاسمانا داڵ کۆ -
ئەبێتەوە لەسەر لاکێك ،لە دورەوە بەدی ئەکرێ ،هاتنەوەی
کوری لە مرۆڤ لەدایك بووش،ئاوها بەدی ئەکرێ.

١ عیسا نموونەیەکی بۆ باس کردن ،بۆ فێربوونی نوێژ ـ کردن و داخوازی لە یەزدان بەبێ ماندووبوون، ٢ ووتی (لە شارێکا قازی یەك هەبوو نە لە خوا ئەترسا نە لە مرۆڤ ٣ هەر لەو شارەشا پیرەژنێك هەبوو زۆر ئەچووە لای بۆ داواکردنی مافێکی خۆی. ٤ ئەویش داواکارییە کەی بەردەوام پشت گوێ ئەخست. ٥ قازیەکە دوای ماوەیەك لە دڵی خۆیا ووتی: (باشە من وەك لە یەزدان و لە کەس ناترسم،با هیچ نەبێ لەبەرئەوەی کە ئەو پیرێژنە ئەوەنە بێزاری کردووم،داوای مافی خۆی بۆ بکەم و وەری گرێ،ئەگینا وازناهێنێ و دێت و سەرم ئەهێنێتە ئێش.) ٦ دوای ئەم باسە عیسا ئەڵێت: (بڕوانن کابرایەکی دڵ رەقی گوناهباری وا چی ئەڵێت ٧ باشە ئایا یەزدان،بەوانەی کە شەو و رۆژ نوێژی بۆ ئەکەن مافی خۆیان ناداتێ؟ وەڵامیان ناداتەوە؟ ٨ من پێتان ئەڵێم: یەزدان بەدەم ئەوانەوە دێت و مافی

خۆیان ئەداتێ . بەڵام ،ئایا کاتێ کوری لە مرۆڤ لەدایك بو ئەگەڕێتەوە ،ئەو باوەرە لەسەر زەوی بەدی ئەکات؟ )
٩ ئینجا عیسا نموونەیەکی تری هێنایەوە بۆ ئەو کەسانەی کە خۆیان زۆر بەپاك دائەنێن و لووت بەرزن و خۆیان بە گەورەتر ئەزانن بەسەر خەڵکیکەدا . ١٠ ووتی : (دوو کەس چوونە پەرستگا بۆ نوێژ کردن ،یەکێکیان فەریسی بوو ئەوی کەشیان باجگرێك بوو. ١١ فەریسیەکە لە دلی خۆیا ووتی : سوپاس بۆ تۆ ئەی یەزدان کە من وەك خەڵکی نیم ،ئەوانەی چاوبرسی و گوناەبار و داوێن پیسن ،هەروەها وەك ئەم باجگرەش نیم. ١٢ دوو جار لە هەفتەیەکا ،بەرۆژو ئەبم ،دەیەکی ئەوش کە دەستم ئەکەوێ زەکاتی ئەدەم .
١٣ بەڵام باجگرەکە لەدوورەوە راوەستا و نەیتوانی بە تەواوی روو بەرزکاتەوە بۆ ئاسمان ،بەڵکو دڵی کردەوە و ووتی : ئەی یەزدان ،من گوناەبارم ،لێم خۆش بە . ١٤ با من پێتان بڵێم : ئەم کابرایە ،گەڕایەوە بۆ ماڵەوە بێ ـ ئەوەی گوناە لەسەر شانی مابێ ،بەپێچەوانەی کابرای فەریسیەوە . ئەوەی خۆی بەرز بگرێ ئەهێنرێتە خوارەوە و

ئەوەش کە لە خوارەوەیە بەرزئەکرێتەوە . )
١٥ ئینجا هەندێ کەس منالانیان هێنا بۆ لای عیسا ،
تاوەك بەدەست لێدان پیرۆزیان کات،بەلام قوتابیەکان
رێیان لێگرتن . ١٦ جا عیسا منالەکانی بانگ کرد بۆ
لای خۆی و ووتی : (واز لە منالان بێنن با بێن بۆ لام،
رێیان لێمەگرن ،چونکە ئەوان چوونە پاشایەتی ئاسمانیان
پێدراوە . ١٧ راستی پێتان بلێم:ئەوەی کە خۆی
ناخاتە رێزەی منالێکی خۆش باوەرەوە ،بۆ باوەر کردن بە
یەزدان ،دەرگای پاشایەتی یەزدان بە روویا دائەخرێ)
١٨ دوای ئەمە ،کابرایەکی دەسەلات داری دەولەمەند ،
پرسیاری لێکرد و ووتی : (ئەی مامۆستای چاك ،چی بکەم
تاوەك ،ژیانی هەتاهەتایی ،بەدەست بهێنم . ) ١٩ عیسا
وەلامی دایەوە و پێی ووت:بۆچی بەچاك بانگم ئەکەیت؟
کەس نیە چاك ،تەنها یەکێك نەبێت،ئەویش یەزدانە .
٢٠ تۆ یاسای یەزدان ئەزانیت:داوێن پیسی مەکە ،
خەلکی مەکوژە ،مالی خەلکی مەخۆ ،گەواهی درۆ مەدە ،
رێزی دایك و باوکت بگرە . ٢١ ئینجا کابرا ووتی :
(ئەمانە هەمووی ،لە منالیەوە زانیومە و لەسەری رۆیشتووم

٢٢ كاتێ عیسا گوێی لەمەبوو،بە کابرای ووت: (کەواتە تەنها شتێکت ماوە،چیت هەیە بیفرۆشە،ئینجا بەشیکە بەسەر هەژارانا،تاوەك لە ئاسمانا گەنجی خۆت دانێیت ئینجا وەرە دووام کەوە.) ٢٣ بەڵام کابرا کە ئەمەی بیست،خەفەتێکی زۆری خوارد،لەبەرئەوەی کە زۆر دەولەمەند بوو. ٢٤ کاتێ عیسا ئەمەی لە کابرا دی، ووتی: (ئای چەند گرانە،چوونە ژوورەوەی دەولەمەندە-کان بۆناو پادشاهێتی یەزدان. ٢٥ چوونە ژوورەوەی حوشترێ لە کونی دەرزیەوە،ئاسانترە لە چوونە ژوورەوەی دەولەمەندێ بۆناو پادشاهێتی یەزدان.) ٢٦ ئەوانەی لەوێ بوون و گوێیان لەمە بوو،ووتیان: (کەواتە ئیتر کێ رزگاری ئەبێت؟ ٢٧ عیساش ووتی: (ئەوەی لای خەڵکی سەخت و گرانە،لای یەزدان سووك و ئاسانە.)

٢٨ ئینجا پەترۆس ووتی: (ئەوەتا ئێمە هەموو شتێکمان بەجێهێشتووە و دووات کەوتووین.) ٢٩ ئەویش پێی-ووتن: (راستی پێتان بڵێم:کەس نیە کە ماڵی،یاخود ژنی،یاخود برا و باوك و دایکی یان منداڵی لە پێناوی پادشاهی ئاسمانا بەجێهێشتبێ و دوو ئەوەنەی

٣٠ ئەوەی کە بەجێی هێشتووە هەر لەم جیهانەدا وەر -
نەگرێتەوە و لە جیهانی داهاتووشا ژیانی هەتاهەتایی
٣١ عیسا دوای ئەمە ،هەر دوانزە قوتابیەکەی بانگ کردو
پێی ووتن : (ئەوا ئێمە بەرەو ئۆرشەلیم ئەرۆین ،هەرچی کە
نێرراوانی یەزدان ،لەبارەی کوری لە مرۆڤ لەدایك بووەوە
نووسیویانە ،هەمووی دێتەدی .
٣٢ ئەو ئەدرێتە دەستی رۆمەکان و گاڵتەی پێ ئەکرێ و
پێی رائەبوێرن و تفیشی لێ ئەکەن . ٣٣ دوای ئەوەی بە
قامچی لێی ئەدەن ،ئەیکوژن .ئینجا لە رۆژی سێهەمدا
زیندووئەبێتەوە . )
٣٤ بەڵام ئەوان هیچ لەمە نەگەیشتن ،چونکە ئەم باسە
جارێ لایان شارراوە بوو.
٣٥ کاتێ عیسا گەیشتە دەوروپشتی شاری ئەریحا ،کابرا-
یەکی کوێری دی کە لەسەر رێگا دانیشتبوو،سواڵی -
ئەکرد . ٣٦ کاتێ کابراکەش گوێی لە رۆیشتنی خەڵکەکە
بوو،پرسیاری کرد ،ئایا ئەمە چیە؟ ٣٧ پێیان ووت:
(عیسای خەڵکی شاری ناسیرەیە لێرەوە تێ ئەپەرێ . )
٣٨ ئینجا کابرا خێرا هاواری کرد و ووتی : (ئەی عیسا

رۆڵەی داود ،بەزەیت پیاما بێتەوە. ) ٣٩ خەڵکەکە خستیانە پێش خۆیان و داوایان لێکرد بێدەنگ بێت، بەڵام ئەو زیاتر هاواری ئەکرد و ئەیقیران (ئەی رۆڵەی داود ،بەزەیت پیاما بێتەوە) ٤٠ عیسا راوەستا و فەرمانیدا کە بیهێنن بۆ لای. کاتێ نزیك بوەوە لێی ـ پرسی : ٤١ (چیت لەمن ئەوێ بۆت بکەم؟ )کابرا ووتی : (گەورەم،رووناکی بگەرێنەرەوە ناو چاوم) ٤٢ ئینجاعیسا پێی ووت: (چاو بکەرەوە،باوەرت چاکی کردیتەوە. ) ٤٣ دەست بەجێ کابرا چاوی کردەوە و رووناکی تێ ـ کەوت،دوای ئەمە کابرا بە ستایش کردنی یەزدانەوە دوای کەوت. خەڵکەکەش کە ئەمەیان دی ،دەستیان کرد بە ستایش کردنی یەزدان.

١ ئینجا عیسا بە شاری ئەریحادا تێپەری . ٢ لەو شارە کابرایەك هەبوو ناوی زەکا بوو،لێپرسراوی باج خانەی ئەوێ بوو،کابرایەکی پارەداریش بوو. ٣ لە کاتێکا کە عیسا بەوێدا ئەرۆیشت،هەولّیدا کە عیسا ببینێت،بەلاّم نەیتوانی چونکە بالاّی کورت بوو. ٤ بەراکردن رۆیشت و بە دارێکی ئەو ناوەدا هەلّگەرا بە هیوای ئەوەوە لەناو خەلّکەکەدا عیسا ببینێت،کاتێ بەوێدا ئەروات. ٥ کە عیسا گەیشتە ئەو جێگایە،چاوی هەلّبری و زەکای بینی،پێی ووت: (ئەی زەکا ،خێراکە لەسەر ئەو دارە وەرە خوارەوە،چونکە من ئەمرۆ میوانی تۆم. ) ٦ زەکاش بەخێرایی هاتەخوارەوە و بەخۆشیەوە پێشوازی لێکرد. ٧ کاتێ خەلّکەکە ئەمەیان دی، دەستیان کرد بە بۆلّەبۆلّ و ووتیان: (ئەوەتا ئەچێتە مالّی یەکێکی گوناەبارەوە. ) ٨ زەکا لەبەردەمی عیسادا راوەستا و پێی ووت: (گەورەم،من ئەمەوێ نیوەی سامانم بەشکەم بەسەر هەژارانا و ئەوش کە زۆرم لێسەندوە و شتێکم لێداگیر کردوە بە چوار قات بۆی ئەگەرێنمەوە)

٩ ئینجا عیسا پێی ووت: (ئەوا ئەمڕۆ ئەم ماڵ و خێزانە رزگاریان بوو،تۆش یەکێك بووی لە نەوە وون بووەکانی ئیبراهیم. ١٠ کوری لە مرۆڤ لە دایك بوو،هاتووە بۆ دۆزینەوەی وون بووەکان و رزگار کردنیان.)

١١ ئا لەم کاتەدا کە خەڵکەکە هەموو گوییان گرت بوو، باسی نموونەیەکی بۆ کردن چونکە ئیتر وا خەریك بوو لە شاری ئۆرشەلیم نزیك ئەبووەوە،زۆریش وایان ئەزانی کە هەواڵی دروست بوونی پادشاهێتی ئاسمان خەریکە وا بانگەواز ئەکرێ. ١٢ عیسا ووتی: (گەورە پیاوێك ویستی بڕوات بۆ شارێکی دوور،بۆ وەرگرتنی فەرمانی حوکمرانی خۆی بەسەر ناوچەیەکدا. ١٣ پێش ئەوەی بڕوات دە ئیشکەری خۆی بانگ کرد و بەهەر یەکێکیان دە پێوانەی دانێ و ووتی: بازرگانی بەم دراوانەوە بکەن تا ئەگەڕێمەوە. ١٤ دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کابرایان خۆش نەئەویست،دوابەدوای ئەو خەڵکیان نارد تاوەك لەوێ بڵێن: ئێمە نامانەوێ ئەم کابرایە فەرمان رەوایمان بەسەرا بکات. ١٥ بەڵام ئەو فەرمانڕەوایی ناوچەکەی بە دەست هێنا و گەڕایەوە،فەرمانیدا ،ئەو دە کەسەی

پارەکەی دابوونێ بێنە لای،تا بزانێ هەر یەکە لەو پارەیەی کە لایەتی چەندی قازانج کردووە. ١٦ یەکەم ـ یان هاتە پێشەوە و ووتی: گەورەم دە کێشانەکەت دە کێشانەی تری قازانج کردووە. ١٧ ئەویش پێی ووت: ئافەرین ئەی ئیشکەری چاك،لەبەرئەوەی کە لەم پارە کەمەدا دەست پاك بوویت،برۆ فەرمان‌ڕەوا بە بەسەر دە شاری ناوچەکەما. ١٨ دووەمیان هاتە پێشەوە و ووتی: گەورەم دە کێشانەکەت پێنج کێشانەی تری قازانج کردووە ١٩ بەمەشیانی ووت: برۆ ببە بە فەرمان‌ڕەوا بەسەر پێنج شارا. ٢٠ ئینجا یەکێکی کەیان هاتە پێشەوە و ووتی: گەورەم ئا ئەوەتا کێشانەکانت،بە پێچراوەیی لەم دەستە ـ سرەدا پارێزگاریم کردووە،٢١ لە راستیا لێت ئەترسم چونکە تۆ مرۆڤێکی توند و تیژی،ئەی‌بەی شتێ کە دات نەناوە و دروێنەی ئەکەیت شتێ کە نەت رواندوە. ٢٢ ئەویش پێی ووت: ئەی ئیشکەری خراپ و بەد هەر بەوەی کە ووتت تاوان‌بارت ئەکەم،تۆ کە زانیت من کابرایەکی توند و تیژم،ئەی‌بەم ئەوەی دام نەناوە و دروێنەی ئەکەم ئەوەی نەم رواندوە. ٢٣ بۆچی نەچوویت پارەکەم بەریتە

لای سووخۆرەکان ،تاوەك لەکاتی گەڕانەوەما خۆی و قازانجەکەشیم وەربگرتایە. ٢٤ ئینجا بەوانەی ووت کە لەویا راوەستاون. هەر دە کێشانەکەی لێ بسەنەوە و بیدەن بەوەی کە دە پێوانەکەی قازانج کردووە.
٢٥ ئەوانیش پێیان ووت: گەورەم ئاخر ئەو دە پێوانەی کەشی پێیە، ٢٦ ووتی: من پێتان ئەڵێم ئەوەی هەیەتی زیاتری پێ ئەدرێ ،ئەوەشی کە نیەتی لێی ئەسنرێتەوە ،گەر شتێکیش شك بەرێ. ٢٧ دوژمنەکانیشم ،ئەوانەی نەیان ئەویست بەسەریانا فەرمانڕەوای بکەم ،بیانهێنن بۆ ئێرە و یەکەیەکە سەریان بڕن.
٢٨ دوای ئەوەی عیسا ئەم قسانەی تەواوکرد ،کەوتەرێ بەرەو ئۆرشەلیم. ٢٩ کاتێ لە ماڵی فاجی و لە ماڵی عەینا نزیك بووەوە ،لای ئەو شاخە بەناوبانگەی شاخی زەیتونی پێ ئەوترێ ،دووان لە قوتابیەکانی نارد و پێی ووتن: ٣٠ بڕۆن بۆ ئەو دێیەی بەرامبەر ،کاتێ ئەچنە ناو دێ ئەبینن گوێدرێژێك بەستراوەتەوە ،ئەو گوێ ـ درێژە تا ئێستە هیچ کەسێك بەهیچ شێوەیەك سواری نەبووە ،گوریسەکەی بکەنەوە و بیهێنن بۆ ئێرە. ٣١ گەر

یەکێ پرسیاری لێکردن ،بۆچی ئەو گوێدرێژە ئەبەن ؟ پێی بلێن ،چونکە گەورەمان کاری پێ هەیە . ٣٢ دوو قوتابیەکە رۆیشتن ،چی عیسا پێی ووتبوون دیبیان و کردیان . ٣٣ لەوکاتەدا گوریسی گوێدرێژەکە یان ئەکردەوە خاوەنەکەی پرسی لێیان بۆچی گوریسی ئەو گوێدرێژە ئەکەنەوە؟ ٣٤ ووتیان : (لەبەرئەوەی گەورەمان کاری پێی هەیە) ٣٥ ئینجا هێنایان بۆ عیسا و جلەکانیان خستە سەر پشتی و عیسایان سوار ـ کرد . ٣٦ جا لەو کاتەدا کە عیسا بەرێوە بوو ،خەلکەکە جلەکانیان دائەکەن و لەسەر رێگای رۆیشتنیا دایان ـ ئەخست .

٣٧ کاتێ لە ئۆرشەلیم نزیك بوەوە ،لەو شوێنەی بەرەوخوار ئەبوەوە بە شاخی زەیتونا ،قوتابیەکانی هەموو زۆر بە شادیەوە بەدەنگی بەرز ستایشی یەزدانیان ئەکرد بۆ ئەو هەموو کارەسەرسوڕ هێنەرانەی کە لە عیسایان بینی بوو ، ٣٨ ئەیان ووت: (پیرۆزە ئەو پادشاهەی بەناوی یەزدانەوە دێت ،ئاشتی و مەزنی بۆ ئاسمان و چینەکانی) ٣٩ بەلام فەریسیەکان و هەندێ لە خەلکەکە ،بە عیسا ـ

یان ووت: (مامۆستا ،قوتابیەکانت بێدەنگ کە) . ٤٠ ئەویش ووتی: (با پێتان بڵێم،ئەگەر ئەوانیش بێدەنگ بن، بەردەکان دێنە هاوارکردن)
٤١ کاتێ عیسا لە شاری ئۆرشەلیم نزیك بوەوە و بینی، فرمێسکی رژاند، ٤٢ ووتی: (ئاشتی زۆر نزیك بوو لێت، کەچی نەت ویست و ئێستەش دەست بەرووبەوە ئەنێیت و ناتەوێت. ٤٣ رۆژێ دێت،دوژمنەکانت بە هێزەوە، لە هەموو لایەکەوە ئابڵۆقەت ئەدەن، ٤٤ ئەتروخێنن بەسەر دانیشتوانتاو،بەردت بەسەر بەردەوە ناهێڵن، بۆچی ئەو هەلەی کە یەزدان دابوووی پێت بەکارت نەهێنا؟)
٤٥ ٤٥ کاتێ عیسا چووە پەرستگای شارەوە،دەستی ـ کرد بە دەرکردنی ئەو کەسانەی کە تیایا خەریکی کڕین و فرۆشتن بوون. ٤٦ پێی ووتن: (نووسراوە: مالّم مالّی نوێژ کردنە،کەچی ئێوە کردووتانە بە ئەشکەوتی دزان.) ٤٧ دوای ئەمە عیسا هەموو رۆژێ لە پەرستگاکەدا،خەریکی دوان و فێرکردنی ووشەی یەزدان بوو. سەرۆکی قەشەکان و نووسەرانی شەریعەت و گەورە

پیاوانی ئەنجومەن ،هەولّیان‌دا کە عیســـا بکـوژن .
٤٨ بەلاّم نەیان توانی ،چونکە خەلّکێکی زۆر لە دەورو ـ
پـشـتـی بـوون .

## بـەشـی بیـســـتەم

١ لە کاتێکا عیسا لەناو پەرستگاکەدا قسەی بۆ خەلّکی
ئەکرد ،سەرۆکی قەشەکان و نووسەرانی شەریعەت و پیاوا ـ
نی ئەنجومەنی پیران لێی هاتنە پێشەوە و ،٢ لەگـەلّـیا
دوان و ووتیان : (پێمان بلّـێ ،تۆ بە فەرمانـی کـێ ئـەم
کارانە ئەکەیت؟ ) ٣ عیسـا وەلاّمـی دانــەوە و ووتــی :
(هەروەها منیش پرسیارێکم هەیە لێتان ،وەلاّمـی بـەنــەوە ،
٤ ئایا فەرمانی خۆ لەئاوهـەلّـکـێـشانـی یـۆحـەنـنـا ،لە
ئاسمانەوە بوو یـان لـە خەلّـکەوە ؟ ) ٥ ئینـجـا ئـەوان
لە نێوانی خۆیانا کەوتنە راوێژ و ووتیان : (ئەگـەر بلّـێین
لە ئاسمانەوە بوو ،ئەلّـێت باشە بۆ باوەڕتان پێ‌نەکـرد ؟
٦ ئەگـەر بشلّـێین لە خەلّـکەوە بوو ،خەلّـکەکـە ئـەکـەونــە
بەردە بارانمان ،چونکە زۆریـان یـۆحـەنـنـا بـە نـێـرراوی
یەزدان دائەنێن ) ٧ ئینجا بە عیسایان ووت ،کە گـوایە

نازانن لە کوێوەیە. ٨ عیساش پێی ووتن: (کەواتە منیش پێتان ناڵێم بە فەرمانی کێ ئەمانە ئەکەم.)
٩ دیسان کەوتەوە قسەکردن بۆ خەڵکەکە و ئەم نموونە ـ یەی بۆ گێرانەوە، ووتی: (کابرایەك رەزێکی ترێی پەروەردە کرد و دایە دەست کۆمەڵێ جوتیار، بۆ ماوەیەکی دوور ـ درێژ ئەوێی بەجێ هێشت. ١٠ لە وەرزی بەروبووم کۆ ـ کردنەوەدا، ئیشکەرێکی خۆی نارد بۆ لای جوتیارەکان، تاوەك بەروبوومی رەزەکەی بۆ بێنێ. بەڵام جوتیارەکان لێیان داو بەدەستی بەتاڵ ناردیانەوە. ١١ کابرا هەڵساو ئیشکەرێکی کەی نارد، ئەوانیش تێروپڕ یان لێدا، سوك و ریسوایان کرد و هەمان شت بەدەستی بەتاڵ ناردیانەوە. ١٢ دیسانەوە کابرا ئیشکەرێکی تری نارد، کەچی بریندار یان کرد و فڕێ یان دایە دەرەوەی رەزەکە. ١٣ کابرای خاوەن رەز ووتی: باشە من چی بکەم؟ لە دوایدا ووتی: کوڕەکەم ئەنێرم، لەوانەیە سڵی لێبکەنەوە و لێی بترسن. ١٤ هەرکە جوتیارەکان کوڕە ـ کەیان دی، خێرا لە نێوان یەکا کەوتنە راوێژ کردن و ووتیان: ئا ئەمەتا ئەوەی رەزەکەی بۆ ئەمێنێتەوە، با هەستین

بیکوژین ،تاوەك بکەوێتە دەستی خۆمان ١٥ ئینجا
هەستان و کورەیان بردە دەرەوەی رەزەکە و کوشتیان.
ئینجا پرسیار ئەوەیە،ئایا کابرای رەزەوان ئەبێ چیان
لێبکات؟ ١٦ ئەو دێت و هەموویان ئەکوژێت و رەزەکە
ئەدا بە جوتیارانی کە.)
کاتێ گوێیان لەمە بوو هەندێکیان ووتیان نابێ چۆن
شتی وا ئەبێت. ١٧ ئەویش سەیری کردن و ووتی:
(کەواتە واتای ئەم ووشانە کە نووسراون چیە؟ ئەو
بەردەی کرێکاران نەیان ویست،بوو بە بەردی بناغە.
١٨ ئەوەی بکەوێت بەسەر ئەو بەردەدا شکستە ئەبێت،
ئەوەش کە بەردەکەی بەسەرا ئەکەوێت بە تەواوی پانی ـ
ئەکاتەوە.) ١٩ سەرۆك قەشەکان و نووسەرانی شەریعەت،
ئەیانویست لێرەدا عیسا بگرن،چونکە باش تێگەیشتن
کە عیسا مەبەستی لەوانە. بەڵام نەیانتوانی ئەمە بکەن
لە ترسی ئەو خەڵکەی لەوێدا بوون.
٢٠ ئینجا عیسایان خستە ژێر چاودێریەوە،هەواڵ ـ
دەری خۆیان،خستەدوا بەناوی باوەڕدارەوە،تا بە ووشە ـ
یەکەوە بیگرن و بیدەنە دەستی فەرمانڕەوایانەوە.

٢١ هەڵئەستان بە پرسیارکردن لێی ،بەم شێوەیە: (گەورەم ئێمە ئەزانین کە تۆ راست ئەرۆیت و راستیش فێری خەڵکی ئەکەیت،گوێ نادەیتە هیچ کەسێ ،هەوڵت تەنها فێرکردنی راستی رێگەی یەزدانە. ٢٢ جا لێت ئەپرسین ،ئایا ئەشێ ئێمە سەرانە بە قەیسەر بدەین؟) ٢٣ عیسا بە فێڵەکەیانی زانی و ووتی: ٢٤ (پارەیەکم بدەنێ ،ئا ئەم وێنەیەی لەسەری نیگار کراوە،هی کێیە؟) ووتیان: (وێنەی قەیسەرە) ٢٥ ئەویش پێی ووتن: (دەکەواتە ،بیدەن بە قەیسەر ئەوەی کە هی قەیسەرە، بیدەن بە یەزدانیش ئەوەی کە هی یەزدانە.) ٢٦ ئیتر لێرەدا نەیان‌توانی بە هیچ شێوەیەك ،تاوان‌باری کەن ، سەرەرای ئەوەش زۆر سەریان سوڕ ما لەوەی کە ئەیان‌بیست ٢٧ هەندێ لە سەدوقیەکان ،ئەوانەی باوەڕ بە زیندو - بوونەوە ناکەن ،لە عیسا هاتنە پێشەوە و پرسیان. ٢٨ ووتیان: (ئەی مامۆستا ،موسا بۆی نووسیوین ،ئەگەر یەکێ برایەکی خێزان‌داری مرد و منالی نەبوو ،لەسەر براکەی کەیە ،براژنەکەی بهێنێت و بەناوی براکەیەوە وەچە بخاتەوە. ٢٩ جا حەوت برا هەبوون ،یەکەمیان ژنی

هێناو مرد بێ ئەوەی منالّ بەجێ بهێلّێت، ٣٠ دوایی برای دووەم هێنای و ئەویش مرد . ٣١ ئینجا برای سێهەم . . . . . . . هەتا گەیشت بە برای حەوتەم هەموو مردن بێ ئەوەی نەوە بخەنەوە . ٣٢ لە دوایدا ژنەکەش مرد . ٣٣ ئایا لە رۆژی زیندوبوونەوەدا ،ئافرەتەکە ئەبێ بە ژنی کامیان ؟ )
٣٤ عیسا وەلامی دانەوە و ووتی : (مرۆڤی ئەم سەر - دەمەی ئێستا ،ژن ئەهێنن و شوو ئەکەن . ٣٥ بەلام ئەوانەی لە ریزی بەشدارانی سەردەمی داهاتوودان دوای زیندوبوونەوە ،ژن ناهێنن و شوو ناکەن . ٣٦ ئەوان ئیتر مردن نابیننەوە ،چونکە ئەبنە فریشتە ، ئەبنە رۆلّەی یەزدان ،چونکە لە مردن زیندوکراونەتەوە بۆ بۆ ژیانێکی نوێ . ٣٧ مردوان هەموو زیندوئەکرێنەوە ، موساش ئەمە باس ئەکات ،لە دوانیا لەسەر گڕە ئاگرینە - کە بە یەزدانی ئیبراهیم و یەزدانی ئیسحاق و یەزدانی یاقوب . ٣٨ یەزدان یەزدانی مردوان نیە ،بەلّکو یەزدانی زیندوانە ،لای ئەو هەموو زیندوئەبنەوە . )
٣٩ لێرەدا هەندێ لە نووسەرانی شەریعەت ووتیان :

(ماموٚستا ،بەراستی باشت ووت. ) ٤٠ ئیتر دوای ئەمە کەسیان نەیانتوانی هیچی کەی لیٚبپرسن. ٤١ ئینجا عیسا پرسی و ووتی : (باشە چوٚن ئیٚوە ئەلیٚن : مەسیح کوری داودە، ٤٢ لە کاتیٚکا داود لە زەبورا کە لەسەر مەسیح ئەدویٚت،ئەلیٚت: یەزدان لەگەڵ گەورەما دواو ووتی : دانیشە لەلای راستمەوە، ٤٣ تاوەك دوژمنەکانت بخەمە بەر پیٚتەوە. ٤٤ ئەوەتا داود بە گەورەی خوٚی دایئەنیٚت ،ئیتر چوٚن ئەبیٚتە کوری ؟ )

٤٥ لەو کاتەدا کە خەلّکەکە هەموو گوێیان گرت بوو بە قوتابیەکانی ووت: ٤٦ (ئاگاداری نووسەرانی شەریعەت بن ،ئەوانەی بە جلی جوانی بریسکەدارەوە ئەگەڕێن و حەزئەکەن لە گوٚڕەپانەکانی شارا سلاویان لیٚبکریٚت و لە شویٚنی کوٚبوونەوەکانا ریزی پیٚشەوە ئەگرن ،هەروەها ریزی یەکەمیش لە کاتی بانگکردنا بوٚ نانخواردن ٤٧، مالّی پیریٚژن ئەخوٚن و دریٚژە بە نویٚژەکانیان ئەدەن . یەزدان لیٚپرسینەوەی سەخت و تایبەتی هەیە بوٚ ئەمانە )

١ لە كاتێكا عیسا ئەیڕوانیە ئەو پارەدارانەی پارەی خێریان دائەنا بۆ پەرستگاكە، ٢ پیرێژنێكی هەژاری بینی كە دوو فلس دائەنێت. ٣ ئینجا ووتی: (ڕاستی پێتان بڵێم، ئەم بێوەژنە، لە هەموو ئەوانەی تر زیاتر پارەی دانا. ٤ چونكە ئەوانەی تر لەوەی كە لە خۆیان زیادە، دایان‌نا، بەڵام ئەم بێوەژنە دای‌نا ئەو پارەیەی كە پێویستی پێیەتی بۆ ژیانی خۆی.)
٥ عیسا دوای ئەمە گوێی لە هەندێكیان بوو كە باسی جوانی بەردی پەرستگاكەیان ئەكرد لەگەڵ نەخش و نیگاری دیوارەكانیا. ٦ ووتی: (ئەمەی ئێستا ئەی‌بینن، ڕۆژێ لە ڕۆژان دێت كە بەردی بەسەر بەردیەوە نامێنێت و ئەڕوخێت.) ٧ ئینجا پرسیان‌لێی: (مامۆستا كەی ئەمە ئەبێت؟ ئەو نیشانانە چیە كە دەرئەكەوێت، كاتێ ئەم ڕووداوە نزیك ئەبێتەوە؟) ٨ عیسا ووتی: (ئاگادار بن هەڵنەخەڵەتێن زۆر هەن بەناوی منەوە دێن و ئەڵێن ئێمە ئەوین، كاتی ئەو شتە نزیك بۆتەوە، نەكەن

دوایان‌کەون . ٩ کاتێ باسی شەڕ وشۆر و تێك‌چوون ئەبیستن ،مەترسن ،چونکە ئەو شتانە ،پێویستە کە یەکەم جار رووبدات،بەڵام کۆتایی پێ‌هاتنی وا زوو نایەت. )
١٠ ئینجا پێی ووتن : (خەڵکی ئەچن بەگژ خەڵکیا و وولات بەگژ وولاتی کەدا ، ١١ لە زۆر شوێن بوومەلەرزە ئەبێت،برسێتی و نەخۆشی بڵاوئەبنەوە ،لەئاسمانەوە نیشانەی ترسناك و مەزن رووئەدات. ١٢ بەڵام پێش ئەمانە هەموو خەڵکی دەستتان بۆ درێژ ئەکەن و ریسواتان ئەکەن ، ئەتان‌بەن بۆ شوێنی کۆبوونەوەکانیان و بۆ بەندیخانە ، ئەتان‌بەنە بەردەم پادشایان و فەرمانرەوایان ،لە پێناوی ناوی منا . ١٣ بەلام ئەمە سودی ئەبێت و کاتێکی باش ئەبێت بۆ باوەڕتان . ١٤ پێویست ناکات پێش ئەوە خۆتان ئامادەکەن بۆ شێوەی بەرگری لە خۆتان ، ١٥ چونکە من ووتە و داناییەکتان ئەدەمێ کە هەموو ئەوانەی بەربەرەکانیتان ئەکەن ،نەتوانن وەلامتان بەنەوە و بەرهەڵستیتان بکەن . ١٦ تەنانەت باوك و دایکیشتان یان برا و خزم و هاوڕێتان ،ئەتان‌دەن بەدەستەوە ، هەندێکیشتان لێ‌ئەکوژن . ١٧ لە پێناوی ناوی منا

خەڵکی رقتان لێ هەڵئەگرن، ١٨ بەڵام مویەك لەسەر ـ
تان نافەوتێ. ١٩ بەدان بەخۆداگرتنا، ئێوە ژیان
ئەبەنەوە.
٢٠ کاتێ ئەبینن کە سوپا دەوری ئۆرشەلیمی داوە،
بزانن کە روخاندنی نزیك بۆتەوە. ٢١ ئەوسا راکەن
ئەوانەی لە ناوچەی یەهودیادان بەرەو چیاکان، ناوشار
بەجێ بهێڵن، ئەوانەی لە لادێکانیشەوە رائەکەن نەچنە ناو
شار، ٢٢ چونکە ئەو رۆژانە رۆژی تۆڵەسەندنەوەیە، ئەوەی
نووسراوە ئەبێت هەمووی بێتەدی، ٢٣ قوڕ بەسەر سك ـ
پڕان و شیردەران لەو رۆژەدا، چونکە ناخۆشیەکی گەورە
دێ بەسەر زەویا و تورەبوونێکی بەهێز دائەبەزێ بەسەر
خەڵکیا. ٢٤ بە زەبری شمشێر دەست بەسەر ئەکرێن و
بەدیلی ئەبرێن بۆ وولاتانی کە، گەلان ئۆرشەلیم پێشێل
ئەکەن، تا یەزدان دەسەلاتی بێباوەڕەکان کۆتای پێ ـ
ئەهێنێ.
٢٥ لەم کاتەدا لە رۆژ و لە مانگ و ئەستێرەکانا نیشانە
دەرئەکەون، گەلە سەرلێشێواوەکان ئەکەونە تەنگانەیەکی
زۆرەوە، چونکە شەپۆل و کەف و کوڵی دەریاکان جۆش

ئەخۆن و هەلّئەسن. ٢٦ خەلّکی لە ترسا بیٚهۆش ئەبن
لەبەرئەوەی نازانن چی بەسەر ناوچەکەیانا دیٚت. چونکە
ئەوانەی بە ئاسمانەوەن لە جیٚی خۆیان نامیٚنن و ئەکەونە
جولّە. ٢٧ لەو کاتەدا ئەبینرێ کە چۆن کوری لە
مرۆڤ لەدایك بوو،بە شکۆ و هیٚزەوە لەناو هەورا
دەرئەکەویٚت و دیٚت.
٢٨ (کاتیٚ ئەم شتانە،دەستیکرد بەوەی کە رووبدات،
هەستن و سەر بەرزکەنەوە،چونکە رزگاریتان نزیك بۆتەوە)
٢٩ ئینجا نمونەیەکی بۆ هیٚنانەوە ووتی:سەیری دار ـ
هەنجیر و دارەکانی کە بکەن، ٣٠ کاتیٚ کە ئەبینن ئەوا
گەلاّ ئەکات،ئەزانن کە هاوین نزیك بۆتەوە. ٣١ ئیٚوەش
هەر بەم شیٚوەیە،کە بینیتان وا ئەم شتانە رووئەدات
بزانن کە مەملەکەتی ئاسمان نزیك بۆتەوە. ٣٢ راستی
پیٚتان بلّیٚم:ئەم نەوەیە لەناوناچن،هەتا ئەمانە هەمووی
روونەدات. ٣٣ ئاسمان و زەوی لەناوئەچن،بەلاّم ووشە
کانم بەهیچ جۆرێ لەناوناچن.
٣٤ ئاگاداری خۆتان بن،نەوەك دلّتان برِوات بۆ
یاری و مەزاق و سەرخۆش و بیری ژیان،ئینجا ئەو رۆژە

تان لە کیس بچێ. ٣٥ چونکە هاتنەکەی مسۆگەرە و لە
پڕە،بۆ هەمووان،٣٦ بەخەبەر بمێنەوە و بەردەوام
خەریکی نوێژ کردن بن،تاوەك ڕزگارتان بێت لە هەموو
ئەم شتانەی کەوا ڕوودەدات،ئینجا ڕائەوەستێت بەرامبەر
کوڕی لە مرۆڤ لە دایك بوو.

٣٧ عیسا بە ڕۆژا لە پەرستگاکە خەریکی فێرکردن بوو،
لە شەویشا ئەرۆشتە دەرەوە بۆ ئەو چیایەی ناوی چیای
زەیتون بوو. ٣٨ خەڵکی بەیانی زوو ئەهاتن بۆ
پەرستگاکە،بۆ ئەوەی گوێی بۆ ڕاگرن.

١ جەژنی قوربان نزیك بوو بوەوە،٢ هێشتا هەوڵی سەرۆك قەشەکان و نووسەرانی شەریعەت بەردەوام بوو بۆ لەناوبردنی عیسا ،بۆ ئەم کارە ترسی ئەوان تەنها لە هەڵچوونی خەڵکەکە بوو. ٣ شەیتان چووە مێشکی یەهوزاوە ،کە بە ئەسخەریۆتی بەناوبانگ بوو،هەروەها یەکێك بوو لە دوانزە قوتابیەکەی عیسا . ٤ رۆیشت و قسەی لەگەڵ سەرۆك قەشەکان و پاسەوانانی پەرستگاکە کرد ،بۆ پیشاندانی رێگەیەك بۆ گرتنی عیسا . ٥ ئەوانیش ئەمەیان زۆر بەدڵ بوو،بڕیاریشیاندا هەندێ پارەی بدەنێ. ٦ ئەویش بەمە رازی بوو، چاوەڕێی هەلێکی ئەکرد ،بێ ئەوەی خەڵکەکە پێی بزانن لە لایەکی لابەلاوە عیسا نیشانی چەند سەربازێ بدات تا بیگرن.

٧ جەژنی قوربان ،ئەو جەژنەی قوربانی تیا سەرئەبررێ هاتە پێشەوە. ٨ عیسا پەترۆس و یۆحەننای نارد و پێی ووتن: (بڕۆن نانی جەژنی قوربانمان بۆ ئامادە -

کەن ،تا بەیەکەوە بیخۆین . ) ٩ پرسیان لێی : (ئەتەوێ لە کوێ ئامادەیکەین ؟ ) ١٠ پێی ووتن : (کاتێ کە چوونە ناوشار ،یەکێ ئەبینن بە شەربەیە ئاوەوە ،دوایکەون بۆ ئەو ماڵەی بۆی ئەڕوات. ١١ ئینجا بە گەورەی ماڵەکە بڵێن : مامۆستامان پێت ئەڵێت :کوا ئەو ژووری میوانەی لەگەڵ قوتابیەکانما نانی جەژنی قوربانی تیا ئەخۆم ؟ ١٢ ئینجا ئەویش ژوورێکتان لە نهۆمی دووەمی خانووەکە پیشان ئەدات،گەورە و ڕاخراو ئا لەوێدا نانی جەژنی قوربانمان ئامادەکەن . ) ١٣ ئەوانیش ڕۆیشتن و شوێنەکەیان دۆزیەوە ،هەروەك عیسا پێی ووتبوون ،ئینجا هەرلەوێ نانی جەژنیان ئامادەکرد .

١٤ کە کاتی نانخواردن هاتە پێشەوە،هەموو قوتابیە ـ کانی ئەوەی کە ئەیەوێ وەك نێرراوی خۆی بیان‌نێرێت، لەسەر خوان لەگەڵیا دانیشتن . ١٥ ئینجا عیسا پێی ووتن : (زۆر ئارەزوی ئەوەم ئەکرد نانی جەژنتان لەگەڵا بخۆم ،پێش ئەوەی بکەومە ئازارەوە. ١٦ پێتان ئەڵێم :ئیتر نانی جەژن ناخۆم تاکو پادشاهێتی یەزدانم تیا دێتەدی . ) ١٧ جامێ شەرابی هەڵگرت و سوپاسی

یەزدانی کرد و ووتی : (بگرن ،بەشیکەن لە نێوانتانا .
١٨ پێتان ئەلێم:ئیتر من لە بەری ترێ ناخۆمەوە تا
پادشاهێتی ئاسمان دێت. ) ١٩ دوای ئەمە نانێکی
هەلگرت و سوپاسی یەزدانی کرد ،نانەکەی لەت کرد و
دای پێیان و ووتی : (ها ئەمە لەشمە،ئەوەی لە پێناوتانا
بەخت ئەکرێ،یادی بکەنەوە تاوەك ئازارم و مردنم لەیاد
نەکەن . ) ٢٠ ئینجا دوای نانخواردنەکە،جامی هەڵ -
بری و ووتی : (ئەم جامە بریتی‌یە لە سەردەمی تازە کە
دروست ئەبێت بە خوێنی من ،ئەوەی لە پێناوتانا ئەڕژێ
٢١ ئەوەش کە ئەمدات بە دەستەوە،ئێستا لەسەر ئەم
خوانە لەگەڵمایە. ٢٢ کوڕی لە مرۆڤ لەدایك بوو
پێویستە بڕوات لەسەر ئەو ڕێگەیەی کە دانراوە،بەلام
قوڕ بەسەر ئەو کەسەی کە ئەیدا بە دەستەوە . )
٢٣ قوتابیەکانی لەناو خۆیانا کەوتنە پرسیار کردن : (تۆ
بلێی کێ بێ ئەمەی ئەوە ئەکات؟ )
٢٤ ئینجا دوای ئەمە بوو بەشەرە قسەیان لەناو یەکا کە
گوایە ئایا کامیان بە گەورەتر یان بە مەزنتر دائەنرێ
لە ناویانا . ٢٥ عیسا پێی ووتن : (لەم جیهانەدا

گەورەکان گەل پێ‌شێل ئەکەن ،دیکتاتۆرەکانیش تەنها خەریکی ئاهەنگ گێرانی خۆیان ئەبن . ٢٦ کەواتە با هەوڵتان بۆ دەستکەوتنی گەورەیی نەبێ ،بەڵکو با گەورەتان ببێ بە بچووکتان و پێشرەوتان وەك ئیشکەرێکی ساکار وابێت. ٢٧ گەورەکانی ئەمڕۆ کێن؟ ئەوانن کە باڵیان لێ‌داوەتەوە و ئیشیان بۆ ئەکرێ ،یان ئەوانن کە ئیش ئەکەن؟ شتێکی ئاشکرایە ئەوانەن کە ئیشیان بۆ ئەکرێ. ئەوەتا من لە نێوانتانا وەك ئیشکەرێکم. ٢٨ ئێوە لە رۆژانی تاقی‌کردنەوە و ناخۆشیما ،پشتگیریتان کردم. منیش لە رۆژانی حوکمرانیما بەشداری کردنی حوکمـ رانیتان پێ‌ئەسپێرم ،هەر بەوشێوەیەی کە باوکم بە منی سپاردووە. ٣٠ تاوەك لە پادشاییەکەما ،لەسەر خوانم بخۆن و بخۆنەوە و لەسەر کورسی حوکمرانی دانیشن و هەر دوانزە خێڵەکەی ئیسرائیل تاوانبار بکەن.

٣١ (سەمعان ،سەمعان ،ئەوەتا شەیتان لە دەور و خولتانە ،تاوەك هەڵتان سەنگێنێ، ٣٢ بەڵام من نوێژم بۆ کردبێت،تاوەك باوەڕت بە با نەڕوات،کاتێ ئەگەڕێیتەوە بۆ باوەرت،باوەری خۆت و برایانت بەهێزکە)

٣٣ ئینجا پەترۆس ووتی : (گەورەم ،من ئامادەم بۆ بەندینخانە و بۆ مردنیش لەگەڵت بێم) ٣٤ عیسا ووتی (پەترۆس من پێت ئەڵێم،پێش ئەوەی کەڵەشێری بەیانی بخوێنێ ،تۆ سێ جار بە من ئەڵێیت: من ئەم کابرایە ناناسم. )

٣٥ ئینجا پێی ووتن : (کاتێ من ئێوەم نارد بەبێ توێشو بەبێ پێڵاو،ئایا پێویستان بە هیچ بوو؟ )ئەوانیش پێیان ووت: (نەخێر) ٣٦ ئینجا پێی ووتن : (بەڵام ئێستا ،ئەوەی پریاسکەی پارەی هەیە،با بیبات لەگەڵ خۆیا ،هەروەها ئەوەی چارۆکەیەك نانی هەیە با بیبات لەگەڵ خۆیا . ئەوەش کە نیەتی،با جلەکانی بفرۆشێت و بە پارەکەی شمشێرێکی پێ بکرێ.

٣٧ من پێتان ئەڵێم: پێویستە بێتەدی ،ئەوەی لەبارەی منەوە نووسراوە کە ئەلێت(لە ریزی تاوانبارانا دایان نا )

٣٨ پێیان ووت: (گەورەم ئەوەتا دوو شیر لێرە هەیە. ) پێی ووتن : بەسیەتی ، (مەبەستم دەرخستنی گەورەیی ئەو گیروگرفتە ترسناکەیە کە دێتەرێتان. )

٣٩ عیسا هەروەك جارانی‌کە ،رۆیشت بۆسەر کێوی

زەیتون ،قوتابیەکانیش دوای‌کەوتن . ٤٠ کاتێ گەیشتە ئەو شوێنە ،بە قوتابیەکانی ووت: (نوێژ کەن بۆ ئەوەی کە نەکەونە تاقی‌کردنەوە . ) ٤١ چەند هەنگاوێك لێیان دوورکەوتەوە ،چۆکی‌دادا و دەستی‌کرد بە نوێژ کردن . ٤٢ ووتی : (ئەی باوك ،گەر ئەبێتئەم ئازارەم لێ‌دوور ـ خەرەوە ،بەلاّم با بە خواستی خۆت بێت نەك بە خواستی من . ) ٤٣ لەم کاتەدا ،فریشتەیەك لە ئاسمانەوە دەرکەوت و توانا و هێزی زیاتری دا بە عیسا . ٤٤ لێرەدا عیسا مل‌ملانی لەگەڵ مردنا ئەکرد و زۆر بە گەرمی نوێژ ی ئەکرد ،بە شێوەیەك کە ئارەقی لەشی وەك دلۆپەی خوێن ئەرژایە سەر زەوی . ٤٥ دوای ئەمە هەستا و گەرایەوە بۆلای قوتابیەکانی ،سەیری‌کرد هەموو خەویان لێ‌کەوتووە . ٤٦ ئینجا پێی ووتن : (ئەوە چیە؟ هەستن و نوێژکەن ،تا نەکەونە تاقی‌کردنەوە . )
٤٧ لەوکاتەدا کە عیسا ئەدوا ،چەند پیاوێك هاتن بەرەو رووی عیسا ،یەهوزا کە یەکێ بوو لە قوتابیەکانی عیسا ، پێشیان کەوتبوو،لە عیسا هاتە پێشەوە تاوەك ماچی‌کات. ٤٨ لێرەدا عیسا پێی ووتن : (ئەی یەهوزا ،کوری لە

مرۆڤ لەدایك بوو،بە ماچ نیشانی ئەوان ئەدەیت و ئەی‌دەیت بەدەستەوە؟ )
٤٩ کاتێ ئەوانەی دەوروپشتی عیسا ،زانیان بەوەی کە خەریکە شتێ رووئەدات،ووتیان : (گەورەم دەست کەینە شمشێر وەشانن؟ ) ٥٠ لێرا یەکێکیان شمشێری وەشان و گوێی راستی ئیشکەری یەکێ لە سەرۆك قەشەکانی بڕی .
٥١ عیسا فرمانی‌داو ووتی (دەست هەڵگرن ،راوەستن ) ئینجا دەستی هێنا بە گوێی کابرادا و چاکی کردەوە .
٥٢ ئەو کۆمەڵەی هاتبوونە سەر عیسا ،بریتی بوون لە سەرۆك قەشەکان و پاسەوانانی پەرستگاکە و پیرانی گەل ، عیسا پێی ووتن : ( خۆ من دز و جەردە نیم،ئاوها بە شمشێر و کوتەکەوە هاتونەتە سەرم. ) ٥٣ خۆ من هەموو رۆژێ لەگەڵتانا بووم لە پەرستگاکەدا ،کەچی هیچ دەستتان بۆ نەبردم. ئەمڕۆ تاریکی دەسەلاتی هەیە و رۆژ رۆژی خۆتانە.
٥٤ سەربازە پاسەوانەکان ،عیسایان گرت و بردیان بۆ کۆشکی گەورەی قەشەکان . پەترۆس دوور بە دوور دوایان کەوت. ٥٥ کاتێ هەندێ لە پاسەوانەکان لە گۆڕەپانی

کۆشکەکەدا ،ئاگریان کردەوە و هەندێکیان لە دەورو پشتی ئاگرەکە دانیشتن ،پەترۆسیش چوو لەگەڵیانا دانیشت. ٥٦ یەکێ لە ئیشکەرەکانی ئەوێ کە لە روناکیەکەدا دانیشتبوو پەترۆسی دی ،جوان تێیروانی و ووتی : (ئا ئەمەش لەگەڵیا بوو. ) ٥٧ بەلاّم پەترۆس بەربێچی دایەوە و ووتی : (ئافرەت،من ئەو کابرایە ناناسم. ) دوای ماوەیەکی کەم،یەکێکی کەشی دی ووتی : ( تۆش لەوانیت )بەلاّم پەترۆس ووتی :کابرا ،نەخێر من لەوان نیم ) ٥٩ ئینجا نزیکەی یەك کات ژمێریکە ،یەکێکی کە ووتی : (بەراست ئەمیش لەگەڵیا بوو،چونکە ئەمیش خەڵکی شاری جەلیلە. ) ٦٠ پەترۆس ووتی : (کابرا ،من نازانم تۆ چی ئەڵێت. ) هێشتا قسەکەی تەواو نەکرد بوو، کەڵەشێری بەیانی خوێندی. ٦١ لێرەدا عیسا ئاوڕی - دایەوە و سەیرێکی پەترۆسی کرد ،ئینجا پەترۆس بیری عیسای کەوەتەوە کە پێی ووت: (پێش ئەوەی کەڵەشێری بەیانی بخوێنێ تۆ سێ جار بە من ئەڵێیت من ئەم کابرایە ناناسم. ) ٦٢ ئینجا پەترۆس چووە دەرەوە و گریانێکی بەکوڵ گریا. ٦٣ بەلاّم ئەوانەی کە پاسەوانی

عیسایان ئەکرد ،دەستیان کرد بە پیاکێشانی و گاڵتە ـ پێکردن پێی، ٦٤ چاویان ئەگرت و لێیان ئەپرسی : (پێمان بڵێ ،کێ بوو ئەوەی ئێستا پیای کێشایت؟ )
٦٥ سەرەرای ئەمەش قسەی خراپی زۆریان پێ ووت.
٦٦ کاتێ رۆژ بووەوە ،ئەنجومەنی پیرانی گەل ،ئەوانەی کە لە سەرۆك قەشەکان و نووسەرانی شەریعەت پێك هاتبوون، کۆبوونەوە و عیسایان بانگ کردە بەردەمیان. ٦٧ پێیان ووت: (ئەگەر تۆ مەسیحی ،پێمان بڵێ. ) ئەویش پێی ووتن : (گەر ئەمەتان پێ بڵێم،باوەڕ ناکەن، ٦٨ گەر لێشتان بپرسم،وەلام نادەنەوە. ٦٩ لە ماوەیەکی کەما، ئیتر کوری لە مرۆف لە دایك بوودائەنیشێ لەلای راستی یەزدانەوە. ) ٧٠ لێرەدا هەموو بە سەرسامیەوە ووتیان : (ئەتەوێ بەمەدا بڵێیت کە من رۆڵەی یەزدانم؟ عیسا پێی ووتن : (بەڵێ ئێوە راستتان ووت،من ئەوم. )
٧١ ئینجا ووتیان : (ئیتر پێویستی چیمان بە شایەت هەیە؟ئەوەتا ئێمە گوێمان لێبوو بە گوێی خۆمان. )

١ دوای ئەمە ئەنجومەنی پیران هەستان و عیسایان برد بۆلای پیلاتۆس کە لێپرسراوی رۆمەکان بوو لەو ناوچەیە. ٢ دەستیان کرد بە تاوانبار کردنی،ووتیان: (بۆمان دەرکەوتووە کە ئەم کەسە رێ تێکئەدات لە گەلەکەمان،هەروەها هانی خەڵکی ئەدات کە سەرانە نەدەن بە قەیسەر و خۆشی بە مەسیحی پادشاه دائەنێ) ٣ پیلاتۆس لێی پرسی: (تۆیت پادشای جولەکە؟) عیسا وەڵامی دایەوە: (تۆ ووتت) ٤ ئینجا پیلاتۆس بە سەرۆك قەشەکان و خەڵکەکەی ووت: (من هیچ گوناهێك لەم کەسەدا نابینم) ٥ بەڵام ئەوان پێیان داگرت و ووتیان (ئەم کابرایە گەل ئەهەروژێنێ،لە هەموو ناوچەی یەهودیادا،هەر لە جەلیلەوە تا ئێرە خەریکی فێرکردن و هاندانی خەڵکە.) ٦ کاتێ پیلاتۆس ناوی جەلیلی بیست،ووتی: (ئایا ئەم کابرایە خەڵکی جەلیلە؟) ٧ لە وەڵاما زانی کە ئەو سەر بەو ناوچەیە کە هیرۆدس حوکم ـ ڕانی،تیا ئەکات،ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە خۆی لەم

باسە دوورخاتەوە،جا عیسای نارد بۆ لای هێرۆدس.
٨ کاتێ هێرۆدس عیسای بینی،زۆر پێی خۆش بوو.
چونکە دەمێك بوو زۆر باسی عیسای بیستبوو،ئەیویست
خۆی و کارێ لە کارە سەرسورهێنەرەکانی ببینێت.
٩ جۆرەها پرسیاری لێکرد،بەڵام ئەو هیچ وەڵامێکی
نەدایەوە. ١٠ سەرۆك قەشەکان و نووسەرانی شەریعەت،بە
گەرمی تاوانباریان ئەکرد. ١١ هەروەها هێرۆدس و
سەربازەکانیش بەرقەوە سەیریان کرد و تێر گاڵتەیان
پێکرد،ئینجا پاڵتۆیەکی بریسکەداری پادشاهانەی لەبەر
کرد و ناردیانەوە بۆ لای پیلاتۆس. ١٢ هەرچەندە کە
هێرۆدس و پیلاتۆس دوژمنایەتی کۆنیان لە نێوانا بوو،
بەڵام لەو رۆژەدا بوو بوون بە هاورێی یەکتری.
١٣ پیلاتۆس سەرۆك قەشەکان و پێشرەوانی گەلی بانگ
کرد. ١٤ پێی ووتن:(ئێوە ئەم کابرایەتان وەك رێ لە
گەل تێكدەر،هێنا بۆ لام،ئەوەتا منیش دوای ئەوەی لە
باسەکەم کۆڵیەوە،هیچ گوناهێ نابینم لەم کابرایەدا،
بەوەی ئێوە تاوانباری ئەکەن. ١٥ دیارە هێرۆدسیش
هیچ هەڵەیەکی تیا شك نەبردوە،بۆیە ناردویەتیەوە بۆ

لامان. ئەوەتا ئەم كابرايە شتێكی وای نەكردوە كە شایانی مردن بێت. ١٦ فرمانی لە قامچی دانی ئەدەم بەسەرا و بەرەڵای ئەكەم. ١٧ پیلاتۆس هەموو ساڵێك لە جەژنی قوربانا ،لەسەر داواكردنی خەڵكەكە یەكێ لە زیندان كراوانی بۆ ئازاد ئەكردن. ١٨ بەڵام خەڵكەكە هاواریان كرد ،ئەمە بكوژە و باراباس مان بۆ ئازادكە.

١٩ ئەم كابرایەش دیل كرابوو بەهۆی ئاژاوە نانەوە و كوشتنەوە. ٢٠ پیلاتۆس دیسانەوە بۆ دووەم جار،ئارەزوی خۆی دەربڕی ،بۆ بەرەڵا كردنی عیسا. ٢١ هەموو هاواریان كرد: (لەخاچی بە،لە خاچی بە.) ٢٢ ئینجا بۆ جاری سێهەم،لێی پرسین: (چ خراپەیەكی كردوە،من هیچ گوناهێكی تیا نابینم كە شایانی مردن بێت،ئێستا فرمانی لە قامچی دانی بۆ دەرئەكەم و بەرەڵای ئەكەم.) ٢٣ ئەوانیش پێیان داگرت و بە دەنگی بەرز هاواریان كرد و داوای لە خاچ دانیان كرد ،بەمە دەنگیان سەركەوت. ٢٤ ئینجا پیلاتۆس فرمانیدا كە داواكاریەكەیان جێبەجێ بكرێ.

٢٥ ئازادی کرد ئەوەی لەبەر ئاژاوە و کوشتن زیندان کرابوو،لەسەر داواکاری ئەوان. عیساشی خستە ژێر بڕیاری ئەوانەوە.
٢٦ لەو کاتەدا کە ئەیان برد بۆ لە خاچ دان،کابرا- یەکێیان گرت کە لە قەیرەوانەوە هاتبوو،بەناوی سەمعانەوە تازە لە کێڵگەکەی گەڕابووەوە،خاچەکەیان دا بەسەر شانیا تاوەك دوا بە دوای عیسا هەڵی- گرێت. ٢٧ خەڵکێکی زۆر دوای کەوتبوون،هەروەها ئەو ژنانەی کە ئەگریان و لە خۆیان ئەدا. ٢٨ عیسا ئاوڕی بۆ دانەوە و ووتی: (ئەی ئافرەتانی ئۆرشەلیم بۆ من مەگرین،بۆ خۆتان و بۆ منداڵەکانتان بگرین. ٢٩ رۆژانێك دێت،تیایا ئەڵێن،خۆزگەمان بەو ژنانەی کە هیچ منداڵیان نەبووە. ٣٠ ئینجا بە شاخەکان ئەڵێن،بروخێ بەسەرمانا،بە گردەکانیش ئەڵێن دامان پۆشە. ٣١ کە بێ‌گوناه ئاوها لێ‌بکرێ،ئەی ئەبێ گوناهباران چی لێ بکرێ؟)
٣٢ هەر لەو کاتەدا لەگەڵ عیسادا،دوو کابرای دز ئەبران بۆ لە خاچ دان.

٣٣ كاتێ گەیشتنە ئەو شوێنەی کە بە کاسەی سەر ناو ـ
ئەبرا ،لەگەڵ دوو دزەکەدا لە خاچیان دا ،یەکێ لە لای
راستیەوە ئەوی کەش لە لای چەپیەوە. ٣٤ عیسا ووتی:
(ئەی باوك،لێیان خۆش بە،چونکە نازانن چی ئەکەن.)
ئینجا جلەکانی عیسایان دانا و گرەویان لەسەر کرد.
٣٥ خەڵکەکە راوەستا بوون سەیریان ئەکرد ،هەروەها
سەرۆکەکانیش،توانجیان لێئەدا و ئەیان ووت: (خەڵکی
کەی رزگار کرد ،گەر ئەمە مەسیحە و لای یەزدانەوە
هاتووە،با خۆی رزگار کات.)
٣٦ دیسان سەربازەکانیش،گاڵتەیان پێ ئەکرد ،لێی
نزیك ئەبوونەوە و سرکەیان پێئەدا، ٣٧ ئەیان ووت:
(گەر تۆ پادشای جولەکەی،خۆت رزگارکە.) ٣٨ پارچە
یەك تەختەیان بەسەر سەریا هەڵواسی بوو،تیایا نووسرا
بوو،ئا ئەمەتا پاشای جولەکە.
٣٩ یەکێ لە دزەکان،دەستی کرد بە قسە پێ ووتنی و
ووتی: (تۆ مەسیحی؟دەباشە خۆت رزگارکە و ئێمەش)
٤٠ بەڵام ئەوی کەیان،چوو بەگژیا و ووتی: (تۆش لە
یەزدان ناترسی،لەگەڵ ئەوەی کە لە هەمان ئازارایت.

٤١ ئەوەی بەسەر ئێمەدا دراوە،راستە،بەرامبەر بەوەی کە کردومانە. بەلاّم ئەمەی ئەم راست نیە،چونکە هیچی نەکردوە.) ٤٢ ئینجا ووتی: (ئەی عیسا لە یادم مەکە کاتی حوکمرانیەکەت.) ٤٣ عیسا پێی ووت: (راستی پێت بلێم: هەر ئەمڕۆ لەگەلّما ئەبیت لە بەهەشتا.)
٤٤ نزیکی کات ژمێری دوانزەی نیوەڕۆ،تاریکی بالّی کێشا بەسەر هەموو زەویدا،تاوەك کاتژمێری سێی نیوەڕۆ. ٤٥ رۆژ تاریك بوو،دیواری پەرستگاکە لە ناوەراستا دڕزی برد. ٤٦ عیسا بە دەنگی بەرز هاواری کرد و ووتی: (ئەی باوك،ئەوا رۆحم ئەسپێرمە دەستت.)ئەمەی ووت و رۆحی سپارد.
٤٧ کاتێ سەرۆکی سەد سەربازەکەی کە لەوێدا بوو، ئەمەی بینی،ستایشی یەزدانی کرد و ووتی(لە راستیا ئەو کابرایە بێ گوناە بوو) ٤٨ هەروەها ئەو خەلّکەی کە کۆ بووبوونەوە لەویا،بۆ سەیرکردنی لە خاچ دانەکە، کاتێ ئەمەیان بینی،دەستیان کردەوە بە سنگ کوتانن.
٤٩ بەلاّم هەموو ناسیاوەکانی عیسا،لەگەلّ ئەو ئافرەتا ـ نەش کە لە جەلیلەوە لەگەلّیا هاتبوون،لە دوورەوە

راوەستا بوون و ئەیان روانیە ئەم رووداوانە.

٥٠ لەناو ئەندامانی ئەنجومەنی بالادا،کابرایەك هەبوو ناوی یوسف بوو،کابرایەکی باش و بێگوناه بوو، ٥١ رازی نەبوو بە بڕیار و هەڵسوکەوتی ئەندامانی ئەنجومەن و کردارییان. لە شاری رامەی ناوچەی یەهودیا بوو،لەوانە بوو کە چاوەڕوانی مەملەکەتی ئاسمانی ئەکرد. ٥٢ هاتە لای پیلاتۆس و داوای لاشەکەی عیسای لێکرد. ٥٣ ئینجا لەسەر خاچەکە هێنایە خوارەوە و لە قوماشێکی کەتانی پێچا. بردی و خستیە گۆڕێکەوە کە لە بەرد دروست کرابوو،هێشتا کەسی تێنەچوو بوو. ٥٤ ئەو رۆژەش رۆژی خۆ ئامادە کردن بوو بۆ رۆژی شەممە،چونکە نزیك بوو. ٥٥ ئەو ئافرەتانەی کە لە جەلیلەوە بە دوای عیساوە بوون،دوای یوسف کەوتن، گۆڕەکەیان بینی و دییان کە چۆن لاشەکەی لەوێدا دانرا. ٥٦ ئینجا گەڕانەوە و رۆن و بۆن و ئەم شتانە یان ئامادە کرد بۆ چەور کردنی لاشەکە،رۆژی شەممەش بەپێی راسپاردە،پشویان دا.

١ ئافرەتەکان ،رۆژی یەك شەممە بەیانی زوو،بە خۆیان و بۆن و رۆنەکەی ئامادەیان کرد بوو،هاتنە سەر گۆرەکەی ٢ سەیریان کرد کە بەردی سەر گۆرەکە لاچووە، ٣ لاشەکەی عیساش لەوێ نەماوە. ٤کاتێ کە لەم کارە سەریان سورِ ما بوو،لەپڕ دوو کابرایان بە جلی بریسکە دارەوە بە تەنشتی خۆیانەوە دی. ٥ ترس دای گرتن و سەریان شۆڕ کردە سەر زەوی،دوو کابرا کە لێرەدا ووتیان : (بۆچی ئەگەڕێن بە دوای یەکێکی زیندوا لەناو ئەم مردوانەدا ؟ ٦ ئەو لێرە نیە،زیندووبۆتەوە،بیرکەنەوە لەوەی کە لە شاری جەلیل پێی ووتن. ٧ ئەو ووتی : کوڕی لە مرۆڤ لە دایك بوو،پێویستە بدرێ بە دەست گوناهبارانەوە،جا لە خاچ بدرێ و لە رۆژی سێهەما هەستێتەوە) ٨ ئەوانیش لێرەدا قسەکانی عیسایان هاتەوە یاد. ٩ گۆڕەکەیان بەجێ هێشت و گەڕانەوە،هەواڵی ئەم شتانەیان هەموو دا بە بانزە قوتابیەکە و ئەوانی کە. ١٠ ئەوانەی هەواڵی ئەم شتانەیان گەیاند،بریتی بوون

لە مریەمی مەجدەلی ،یۆنا ،مریەمی دایکی یاقوب و هەندێ ئافرەتی تر کە لەگەڵیانا هاتبوون. ١١ گێرانەوەی قسەکانیان هەر لە وڕێنەی ئەکرد ،بۆیە باوەڕیان پێ نەکردن. ١٢ ئینجا پەترۆس هەستا و رای کرد بۆ سەر گۆڕەکە ،کە دانەویەوە تەنها هەر ئەو قوماشەی دی کە تێیەوە پێچرا بوو ،ئینجا ئەوێی بەجێ هێشت ،زۆر بەسەر سوڕمانەوە لەوەی کە رووی دا بوو.

١٣ دووان لەوان ،لەو رۆژەدا چوون بۆ دێیەك نزیکەی حەوت میل لە ئۆرشەلیمەوە دوورە ،کە ناوی عیمواسە. ١٤ لە ڕێ باسی ئەو شتانەیان ئەکرد کە رووی دا بوو. ١٥ لەو کاتەدا کە قسەیان ئەکرد ،عیسا خۆی نزیك بووەوە لێیان و لەگەڵیانا رۆی بە رێدا. ١٦ بەڵام چاویان بەسترا لە ناسینی. ١٧ عیسا پرسی لێیان : ( ئەوە باسی چی ئەکەن بەرێوە؟ ) ١٨ بە سەرسوڕمانێکەوە، راوەستان ،یەکێکیان کە ناوی کەلیۆپاس بوو ووتی : (چیە، ئەڵێت هەر تۆ نامۆیت کە لە ئۆرشەلیما لات داوە ئاگات لەوە نیە کە لەم رۆژانەدا رووی دا؟ ) ١٩ ئینجا پێی ووتن : (چی رووی داوە ،نایگێرنەوە بۆم؟ ) ووتیان : (تۆ

ناوی عیسات نەبیستوە،ئەوەی لە ناسرە بوو،ئەوەی کە
نێرراوی یەزدان بوو وە زۆر توانادار بوو،لە قسە و کاریا
بەرامبەر بە یەزدان و بەرامبەر بە خەڵکی. ٢٠ دوایی
سەرۆك قەشەکان و دادپەروەران ناردیان بۆ لە خاچ ـ
دان. ٢١ ئێمە هیوامان بەوە بوو کە ئەو مەسیحی
چاوەڕێ کراو بێت،ئەوەی یەزدان پەیمانی داوە بینێرێت
بۆ رزگاریمان. لەگەڵ ئەوەشا کە ئەمرۆ رۆژی سێهەمە
ئەمە رووی‌داوە،٢٢ هەندێ لە ئافرەتەکانمان،بە
هەواڵێك زۆر سەریان سوڕ هێنایین چونکە بەیانی زوو
چووبوونە سەر گۆرەکە،٢٣ لاشەکەیان نەبینی بوو،ئینجا
گەڕانەوە و ئەمەیان باس کرد و ووتیان:ئێمە دوو
فریشتەشمان دی کە ئەیان ووت: ئەو زیندوە.
هەندێ لە ئێمە چووە سەر گۆرەکە و سەیریان کرد ئەوەی
ئافرەتەکان گێرایانەوە راستە و لە گۆرەکەدا کەسیان
نەدی. ٢٥ ئینجا عیسا پێی ووتن: (ئەی تێ ـ
نەگەیشتوان،ئەی کەم باوەران،بە هەموو ئەوانەی کە
نێرراوانی یەزدان باسیان کردوە،٢٦ ئەی باشە
نەئەبوایە کە عیسای مەسیح ئەم ئازارانە بچێژێ و ئینجا

سەرکەوتن بەدەست بهێنێت؟ ) ٢٧ ئینجا دەستی کرد بە روون کردنەوەی ئەو شتانەی کە لەسەری نووسراوە، هەر لە موساوە تا دوا نێرراوی یەزدان. ٢٨ ووردە ووردە نزیك ئەبوونەوە لەو دێیەی کە قوتابیەکان بۆی هاتبوون. عیسا وا خۆی نیشاندا کە ئەو ئەروات بۆ شوێنێکی دوور تر. ٢٩ قوتابیەکان زۆریان لێ‌کرد و ووتیان: (ئەوا رۆژ ئاوا ئەبێت و تاریك ئەبێت، بمێنەرەوە لامان. ) ئەویش بەمە رازی بوو، لەگەڵیانا هاتە ماڵەوە. ٣٠ کاتێ لەسەر خوان دانیشتن، دەستی برد نانەکەی هەڵگرت، پیرۆزی کرد و لەتی کرد، ئینجا دای پێیان. ٣١ دەست بەجێ چاویان کرایەوە و ناسیانەوە، ئینجا لەبەر چاویان نەما. ٣٢ یەك بە یەکیان ووت: (ئەمە بۆیە کاتێ لە رێ قسەی بۆ ئەکردین، دڵمان لەناو سنگمانا وەك ئاگر گری گرتبوو. ) ٣٣ دوای ئەمە یەکسەر هەستان و گەڕانەوە بۆ ئۆرشەلیم، سەیریان کرد یانزە قوتابیەکە و ئەوانەی کە لەگەڵیانن، هەموو کۆبوو ـ نەتەوە، ٣٤ بانگیان ئەکرد و ئەیان ووت: (راستە گەورە مان هەستاوەتەوە، دەریش کەوتووە بۆ سەمعان. )

٣٥ لێرەدا هەردوکیان دەستیان کرد بە گێڕانەوەی ئەوەی لە ڕێگادا ڕوویدا بوو،ئینجا چۆن لە کاتی نان شکانەکەدا ناسیانەوە.
٣٦ لەو کاتەدا کە لەم باسە ئەدوان،عیسا خۆی هاتە ناوەڕاستیانەوە،لە نێوانیانا ڕاوەستا،پێی ووتن: (سلاوتان لێ بێت) ٣٧ بەڵام لەبەر ترس و لەرزی خۆیان وایان زانی ئەمە خەیاڵە. ٣٨ عیسا پێی ووتن: (ئەوە بۆچی وا سەرتان لێ شێواوە؟بۆچی دوو دڵن؟ ٣٩ سەیری دەست و قاچم کەن،دەستم لێ دەن،خەیاڵ گۆشت و ئێسقانی نیە وەك ئەم گۆشت و ئێسقانەی ئێستا هەمە) . ٤٠ کاتێ ئەمەی ووت دەست و قاچی کە شوێنی بزمارە کانی پێوە بوو،نیشانی دان. ٤١ لە خۆشیا بە تەواوی باوەڕیان نەئەکرد و زۆر سەریان سوڕمابوو پێی ووتن: (هیچتان لێرە هەیە کە بخورێت؟) ٤٢ پارچەیەك ماسی هەڵگرت. ٤٣ لەبەر چاویانا خواردی.
٤٤ ئینجا پێی ووتن:ئا ئەمەیە ئەو قسانەی کە بۆم کردن،کاتێ لەگەڵتانا بووم:پێویستە هەموو ئەوانەی کە لە شەریعەتی موسا و نێرراوانی یەزدان و زەبورا هەن و

نووسراون بیّته دی. ٤٥ ئینجا بیر و هۆشی کردنەوە، تاوەك تیّ بگەن. ٤٦ پیّی ووتن: (ئا ئاوها نوسراوە، پیّویست بوو کە عیسای مەسیح ئازار بکیّشیّ و بمریّ و دوای لە رۆژی سیّهەما زیندوبیّتەوە. ٤٧ تاوەك داوای سڕینەوەی گوناه بکات،لەناو هەموو گەلانا،بە دەست ـ پیّ کردن لە ئۆرشەلیمەوە. ٤٨ ئەوا ئیّوە شایەتی ئەم شتانەن. ٤٩ ئیّستاش ئەینیّرم ئەوەی باوکم پەیمانی پیّ داوم بەلاّم جاریّ لەناو شارا بمیّننەوە،تا ئەو کاتەی کە لە ئاسمانەوە جلی بەهیّزیتان لەبەرئەکریّت) ٥٠ دوای ئەمە پیّشیان کەوت و بردنی بۆ شاری بەیت عەینا بە دەست بەرزکردنەوەوە داوای پیرۆزی بۆ کردن. ٥١ لەو کاتەدا کە داوای پیرۆزی بۆ ئەکردن،لیّیان جیابوەوە و بەرزبوەوە بۆ ئاسمان. ٥٢ چۆکیان بۆ داداو ئینجا زۆر بە شادیەوە گەڕانەوە بۆ ئۆرشەلیم. ٥٣ بەردەوام ئەرۆیشتن بۆ پەرستگاکە و لەویّ ستایشی یەزدانیان ئەکرد.